بەرنامەی ڕزگاری مرۆڤ

# ڕێگاکانی پەروەردەی ئیمانی

م.سلاح قادر حسین چنارەیی

- چۆن لە زمان بەدوور نەبی ؟
- چۆن چاک دەبی ؟
- کە :
- چاکێتی ئاواتی هەموو مرۆڤێکە .
- مایەی خۆشی و سەربەرزییە .

چاپی یەکەم

٢٠١٢

بەرنامەی رزگاری مرۆڤ

# رێگاکانی

# پەروەردەی ئیمانی

مامۆستا

سەلاح قادر حوسەین

چنارەیی

چاپی یەکەم ٢٠١٢

ناوی کتێب : ڕێگاکانی پەروەردەی ئیمانی

نوسینی : م . صلاح قادر حسین چنارەیی

دیزاینی بەرگ : نظام الدين صلاح

نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم

تیراژ : ( ١٥٠٠ ) دانە

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتیەکان ژمارە (          ) ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە .

پێشکەش بە :

- گیانی پاکی هەموو پێشینەکان و شەهیدانی کاروانی خواناسی ..
- هەموو تێکۆشەرانی ڕێگای ڕاستی( صراط المستقیم)
- هەموو چاکە خوازان .

# پێشەکی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە رێزێکی تایبەتی بە مرۆڤ بەخشیوە ، درودی ئەو خوا گەورە برژێ بەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری نازداردا کە چل ساڵ لە قوتابخانەیەکی تایبەتی خواییدا فێرکرا و پەروەردە کرا و بڕوانامەی سەرکەوتوترین پەروەرشکار و پێشەوایی پێ بەخشرا لەلایەن پەروەردگارەوە :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا ﴿٤٧﴾ ﴾الأحزاب/٤٥-٤٧ .

واتە : ئەی پێغەمبەرا بێگومان ئێمە تۆمان ناردووە تاکو شایەتیدەر بیت (بەسەر ئوممەتی ئیسلامەوە کە پەیامی خوات پێ راگەیاندون) وە مژدە بەخشیت (بە ئیمانداران بەوەی رەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین چاوەڕێیانە) وە ترسێنەر بیت بۆ (بێ باوەڕان لە خەشمی خوا و دۆزەخ) .

وە بەرنامەی بەختیاری مرۆڤیشی بۆ نارد:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾الزمر/٢ .

واتە: بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تا حەق و ڕاستی ڕوون بکاتەوە ، کەواتە تەنها خوا بپەرستە و ملکەچ و دڵسۆز بە بۆ ئایین و بەرنامەکەی .

ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بو بە هەڵگرو پەیڕەوکارێکی ڕاستەقینە و باشترین نمونە بۆ لێوەرگرتن و شوێنکەوتنی :

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾الأحزاب/٢١.

واتە: سوێن بە خوا بە ڕاستی پێغەمبەری خوا چاکترین سەرمەشقە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون ، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە ، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە ، وە بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو .

بەڵێ ئەم ئەرکە بە پێغەمبەر(ﷺ) سپێردرا لەو چەرخەی کە بەهۆی نەفامی وگومڕایی مرۆڤەکانەوە بوو بوو بە تاریکستان و جەنگەڵستان، بە خەباتی بێوچانی پێغەمبەر(ﷺ) بانگکردنی مرۆڤەکان بۆ سەر ڕاستە شەقامی ئیسلام، پەروەردەکردنی هاتووان بە پەروەردەی قورئانی، شارستانیەتێکی ئیسلامی بەرپابوو ، بو بە چەرخی زێڕین .

بەڵێ خوای خاوەن هێزو توانای ڕەها بەختەوەری دنیا و قیامەتی بەستوە بە ئیرشادو ئامۆژگاری قورئانیەوە، ئەمەش بەو کەسانە دەبەخشێت کە هەوڵی بۆ دەدەن و خەباتی لە پێناودا دەکەن، ئاشکرایە هەر مرۆڤێك هەڵگری بەرپرسێتی کەسێتی خۆیەتی ، دەبێ زۆر بە گەرمی لە خەمیا بێ، تاکو خۆی نەدۆڕێنێ ، وە نەفسی خۆی پاك و پوخت بکاو

ئیمان و ترسی خوای تیا بڕوێنێ، ئەوکات خۆی دۆزیوەتەوە و بووەتە خاوەنی گەورەترین دەسکەوت.

جا براو خوشکی باوەڕدارم! هێزو تواناکانت بە گەرمی بخەکار لە پێناو سەرکەوتنی خۆت و وەدەستهێنانی بەختیاری، باش ئامادە بە بۆ وەرگرتن لە پەروەرشکارە دڵسۆزەکەت .. لە پاشدا لە پێناو تەواوکردنی باوەڕەکەتدا بکەوە خەمی برا و خوشکانت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی : { لا يُؤمِنُ أحَدُكُم حَتَّى يُحِبَّ لأخيهِ ما يُحِبُّ لِنَفسِهِ } ..

هەر ئەو پاڵنەرەش بەندەی جوڵاند و قەڵەمم گرتە دەست تا خزمەتێك پێشکەش بکەم بە برا و خوشکە مرۆڤەکانم بە گشتی و باوەڕداران بە تایبەتی.

بە هیوای پشتیوانی و تەوفیقاتی خوایی..

نوسەر

## بەرنامەی رزگاری و ئاسودەیی مرۆڤ

خوای گەورە ( بەدیهێنەری بونەوەر و مرۆڤەکان ، مرۆڤی بەدیهێناوە و لەسەر زەوی نیشتەجێی کردووە و ئەرکێکی زۆر گەورەی پێ سپاردوە و بەرنامە و پێغەمبەرانیشی بۆ ناردون ، دوایین پێغەمبەریان محمدە(ﷺ) ، بەرنامەکەشی ئیسلامە کە سەرچاوە سەرەکییەکەشی قورئانە، ئەو قورئانە کە هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووە و هەموویشی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا داناوە:

﴿الر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾

هود/١.

واتە: ئەمە کتێب و پەیامێکە کە ئایەت و یاساکانی بە شێوەیەکی راست و دروست پێکەوە پەیوەست کراون و جۆش دراون، پاشان درێژەیان پێدراوە و روون کراونەتەوە لەلایەن زاتێکەوە کە دانا و بە ئاگا و لێزانە .

﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ﴾القمر/٤٩ .

واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە و ئەخشەی دیاریکراو دروست کردووە . بەڵێ قورئان دەرمانی دەردەکان دەخاتە بەر دەستی مرۆڤ ، رێنمایی جوان و وردی بەکار هێنانیان ئاراستە دەکات ، وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە .. قورئان هێمایەکی رونی کردوە بۆ دەردێکی سامناکی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی کە زیانکردنە ئەمەش لە سورەتێکی کورتی دوودێڕیدا ، کە سورەتی "العصر"ە، یا بە ئاراستەکردنی ئەم پرسیارە بچینە ناو ئەو دەرمانخانە؛ ئەگەر کەسێکی زۆر راستگۆ و دڵسۆز پێت رابگەیەنێت ، بڵێ گەر بچیتە ناو ئەو باڵەخانە

کارەبا دەتگرێت ؛ توخوا ئەگەر باوەڕ بە وتەکەی بکەیت و ژیریت لە کارا بێت دەچیتە ناو ئەو باڵەخانە ؟ گەر کەسەکە سوێندیشت بۆ بخوات لەسەر راستی وتەکەی و تۆش گوێت نەدایە و چویتە ناو ئەو مەترسیە سامناکە ناوی دەنێیت چی ؟ .

بەڵێ دڵسۆزترین کەس بۆ مرۆڤ که خوای بڵند و مەزنە، بەدیهێنەر و خاوەنی بونەوەرە راستگۆترین و بەئاگاترینە .. سوێندمان بۆ دەخوات و ئاگادارمان دەکات کە مرۆڤایەتی بە گشتی لە زیاندایە ؛ لە بازرگانیدا لە پیشە و سەرفکردنی تەمەن، لە ئیش و کار و هەوڵ و خەباتدا ..

﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢﴾ وە دەرمانی ئەو دەردەشمان بۆ دیاری دەکات لەگەڵ شێوازی بەکارهێنانی :﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴾

لەم سورەتەدا بە کورتیو رونی رێگای رزگاری مرۆڤ لە زیانکردنو گەیشتنی بە رەزامەندی خوا دەخاتە پێش چاو، کە ئەوەش ئەوەیە: مرۆڤ هەڵگر و پەیڕەوکاری پەیامی خوا بێ لە ژیاندا ، وە ناوەڕۆك و چۆنیەتی ئەم پەیامەشمان بۆ دیاری دەکات بە کورتی لەم دوو وشەدا ( چاکی و چاکسازی) کە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ هێما دەکات بۆ سیفەتی یەکەم کە چاکبوونە ، وە ﴿تَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ هێما دەکات بۆ سیفەتی دووەم کە چاکسازی یە، کەواتە :

➢ بەشی یەکەم لە پەیامی موسڵمان لە ژیاندا ئەوەیە کە : ( خۆت چاککە و چاکبە ئینجا خەڵکیش بانگکە بۆ چاکبوون) .. چاکبوونیش بریتی یە لە کۆی ئەم دوو ئێوانە:

- دیدێکی راست و دروست دەربارەی گەورەترین راستیەکانی بوون {بەدیهێنەر ، مرۆڤ ، ژیان ، بوونەوەر ، دوژمنی مرۆڤ ، مردن ، پاشەڕۆژ} کە ئەمەش (ءَامَنُوا) دەینوێنێ و تێشکدانەوەیەکە دەکشێت بۆ ژیری قایلی دەکات، وە بۆ دڵ و سۆز و دەیانهەژێنێ ، وە بۆ ویست و دەیجوڵێنێ.

- رەوشتی چاك و کردارو رەفتاری باش کە ( عمل صالح) دەینوێنێ و وەرگێڕانێکی کردارییە بۆ باوەڕ و رەنگدانەوەیەکی رەفتارییە بۆ ئەو بیروباوەڕە.

➢ بەشی دووەم لە پەیامی موسڵمان ئەوەیە کە چاکساز بێت ! بەوەی کە مەشخەڵی مەیدانەکان بێت،وە خێر و چاکەی بۆ هەموو مرۆڤێ بوێ، وە رێگای رەوا و چاکیان بۆ رون بکاتەوە، وە تێکۆشێ بۆ پەخش کردنی رەوشتە جوانەکان و بەها مەزنەکان و نەریتە بالاکان لەناو کۆمەڵدا.

بەڵێ بۆ رزگاربون لەم زیانە سەختە چوار هەنگاوی دەوێ وا بە پشتیوانی خوا بە کورتی و رونی پێشکەشتانی دەکەین :

هەنگاوی یەکەم : پەروەردەی ئیمانی : { ءَامَنُوا}

هەنگاوی دووەم : خستنە گەڕی تواناکان لە چاکە کردندا :

{وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ }

هەنگاوی سێ یەم: رێنمایی کردن و فەرماندان بە راستی و ڕەوا ::

{وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ}

هەنگاوی چوارەم : ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردن بە ئارامگرتن :

{وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ }

پەروەردگارمان بە تەمای تەوفیقات و شیفای تۆین .

**هەنگاوی یەکەم : پەروەردەی ئیمانی : { ءَامَنُوا }**

خوای گەورە مرۆڤی بەدیهێناوەو پێکی هێناوە لەم چوار لایەنە سەرەکییە: { ژیری ، دڵ ، نەفس و لاشە } ..

مرۆڤ کە کاروانی ژیانی دەست پێدەکات لەسەر زەویدا لەکاتی دابەزینییەوە لە منداڵدانی دایکی بەم چوار پێکهاتەوە ژیان دەست پێدەکات کە گەشەیان تەواو نەبووە و خوای بڵند و بێگەرد وای پێکهێناوە بە بچوکی و توانای سنووردارەوە ڕێگا بگرێتە بەر ، وە تایبەتمەندی گەشەکردنی پێداوە :

﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾النحل/٧٨.

واتە: خوای گەورە ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن ، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن .

ئەم چوار لایەنە پێویستیان هەیە بە پێدانی خۆراکی گونجاو و ئاگاداری بەردەوام و پشتگیری و بەهێزکردن تا کاریگەری هەمیشەییان هەبێ لە ئاراستە کردنیان بۆ بەدیهێنانی ئامانجی بوونی مرۆڤ لەسەر زەویدا کە بەندایەتی کردنێکی راستو دروستە کە بە کورتی بریتی یە لە: خۆ شەحن کردن بە نوری خوا بە هۆی پەرستشە تایبەتیەکانەوە وەك نوێژ و رۆژوو ... وە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی و دامەزراندنی شارستانیەتێکی پێشکەوتوو خۆشگوزەرانی ژیان تیایدا تا هەموو مرۆڤەکان بەخۆشی بژین ، وە لە بەجێهێنانی ئەم ئەرکەدا مرۆڤەکان لەتاقیکردنەوەدان :

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝﴾ الملك/٢ .

واتە: ئەو خوا مردن و ژیانی بەدیهێناوە ، تا تاقیتان بکاتەوە ، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەند ترە ، هەر ئەویش زاتێکی بالادەستە بەسەر بێباوەڕاندا ، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران .

وە بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی باش و هەمیشەیی دەرکەوێ لەسەر هەریەکە لەم چوار لایەنەی پێکهاتەی مرۆڤ پێویستە رێگای پەروەردە کردن و گەشەپێکردن و راهێنان بگرنە بەر تاکو پێدەگەن و چاکدەبن و هەریەکەیان بەشداری دەکات بە کاریگەرییەکەی لە پێگەیاندنی موسڵمانێکی چاکەخواز تاکو هەستێ بە جێبەجێ کردنی ئەرکە بنەڕەتیەکەی کە بریتیە لە ناسینی خوا و باوەڕپێکردن و ترسان لێی و بەجێهێنانی دینەکەی لە خودیا، ئینجا لە خودی موسڵمانانداو وە

هاوکارییەکی تەواو بکات لە خەباتی گەیاندنی بە هەموو مرۆڤایەتی ، جا بە کورتی ڕێگای پەروەردەی ئیمانی دەگرینە بەر بەم شێوەیە :

( أ ) پێناسە :

( ١ ) پەروەردە : واتە گەشەکردن و زیادکردن و گەیاندنی هەر گیانلەبەرێك بە تەواویتی بە شێنەیی و ورده ورده .

یا :ڕودانی گۆڕانکاری یا کارتێکردنێکی هەمیشەیی لە شتەکە .. ئیتر ئەکرێ ئەم کارتێکردنە به باشە بێ یا بە خراپە ، وەکو ئەو کەسەی پەروەردە بکرێ لەسەر ڕاستگۆیی، ڕاستگۆ دەردەچێ، وە ئەوی پەروەردە بکرێ لەسەر درۆ، درۆزن دەردەچێ، وە کرداری پەروەردەکردن پێویستی هەیە بە مەشقپێکردنێکی هەمیشەیی تاکو دێتە بەر ..

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی : " الخير عادة " حديث حسن رواه ابن ماجة .

- ڕێکخەرەکانی پەروەردە :

چەند فەرمانێك هەیە پێویستە ڕەچاو بکرێت لەکاتی باس کردن لەسەر پەروەردە و پێداویستیەکەی لە گۆڕانی تاك و کۆمەڵدا ، وەك :

١- پەروەردە لە خۆ بگیرێ وەك جێگیرێکی سەرەکی و تاقانە بۆ گۆڕانکاری ڕاستەقینە، ئەگەر گۆڕینی باری تاك و کۆمەڵ لە خراپەوە بۆ باشترین پەیوەست بێ بە گۆڕینی ئەوەی کە لە نەفسدایە :

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾الرعد/١١.

واتە : بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت( لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی ، یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی، یان لە

گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن .

واتە : بۆ ئەم گۆڕانکاریە پێویستە ڕێگای پەروەردە کردن بگیرێتە بەر. بەڕاستی ئەو بەختیارییەی کە هەمو خەڵکی بەدوایدا دەگەڕێن، دەڕژێت بەسەریاندا لە دەروون و دڵیانەوە، وە هەرگیز لەدەرەوەی دڵەوە دەستناکەوێت ، وە ئەو بەدبەختییەی کە دەوری داون و لێی رادەکەن لە دەروون و دڵەوە دوچاری هاتوون .

٢. پەروەردەکردن بەردەوام بێ و لە پچڕان و وەستان بەدوور بێ : چونکە ئەو فەرمانەی کە بە پێویستی گێڕاوە هەمیشەییە و ناپچڕێ و ناشوەستێ تاکو مردن :

﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾ الحجر/٩٩ .

سەرنجی ئەم ئایەتەش بدە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ ... ﴾ النساء/١٣٦ .

واتە : ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ، بەردەوام و دامەزراو بن لەسەر ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەو قورئانەش کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا دابەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر رەوانەی کردوون .. محمد قطب لەسەر راڤەی ئەم ئایەتە دەڵێت : واتە: پارێزگاری بکەن لەسەر باوەڕەکەتان ، بەردەوام بن لەسەری ، بێ ئاگا مەبن لەسەر پاراستنی ، سارد مەبن لە چاودێری

کردن و رەچاو کردن و خۆراك پێدانی و بەهێز کردن و بایەخ پێدانی.[1]

فەرمودەی رسول الله(ﷺ) کە پشتگری ئەم واتا دەکات: [إنَّ الایمان يَخلقُ في القلوبِ كما يخلقُ الثوبَ ، فجدِّدوا إيمانكم] حديث، حسن رواه الطبراني

هەرچەندە مرۆڤ تەمەنی بەرز ببێتەوە ، پلەی بەرپرسیاری بەرز ببێتەوە ، دەبێ بەردەوام بێت لە پەروەردەبوندا تاکو بتوانێ بەردەوام بێ لە هەڵسان بە ئەرکی بەندایەتیکردن بۆ خوای بڵند و بالادەست ، رە سەرکەوتوو بێت لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە پیشەییەی کە [illegible]زتە ئەستۆی، بە دڵنیاییەوە دڵی مرۆڤ خێرا دەگۆڕێت ، زوو لە بیری دەچێتەوە . دڵ چاکدەبێ روناك دەبێتەوە ، پڕدەبێ لە نور .. بەلام ئەگەر ماوەیەکی بەسەراچو بەبێ بیرخستنەوە ، بەبێ یادکردنەوە ! چڵ و رەق ئەبێ ،

دەروونیش وەك دیلێك وایە کە هەوڵ دەدات بەرەنگاری دیلکردنەکەی ببێتەوە، دەبێ هەمیشە بێدار بیت تاکو لە دەستت هەڵنەیە و ئەو تۆ بەند بکات و ملکەچی فەرمانەکانیت بکات. هەروەها ژیریش پێویستی بەوە هەیە کە بەردەوام زانستی بەسودی پێبدەی تاکو هەستەکانی فراوان بێ و تێگەیشتن و پەی پێبردنی فراوان بێ ، پەنجەرەکانی لێبکرێنەوە ئەوەی ناسینی خوا و لە خوای نزیك دەخاتەوە پەرەبسێنێ : ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾طه/١١٤.

واتە : دوعا بکە و بڵێ : پەروەردگارا بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە .

وە لاشەش بەردەوام پێویستی هەیە بە پەروەردە و وەرزش و جوڵان و راهێنان تاکو بتوانێ پەیڕەوکار و هەڵگر و گەیەنەری د استەقینەی ئیسلام بێ، ئەگەر وانەکات توشی خاوبونەوە و تەمەڵی دەبێ وتەمەش وایلێدەکات کە زۆرێك نهێنی مانا و مەبەستی ئەرەی فێری دەبێ تێنەگات.

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ الحديد/١٦

واتە : ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ، دڵەکانیان بە نوری ئیمان ملکەچ و روناك بۆتەوە ، ترسی خوای تێدا بروێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خوا و ئەو قورئانەی کە رەوانە کراوە، وەك ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ رەوانە کرا، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دور و درێژ ، دڵیان رەق و رەش بوو، زۆربەشیان یاخی و سەرکەش و نالەبار دەرچوون .

ئەم سەرزەنشتەی کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاراستەی یارانی پێغەمبەری کردوە ، پێویستە وامان لێبکات کە هەمیشە بەردەوام بین لە پەروەردە کردنی خۆماندا .

٢. پێویستە پەروەردە کردن هەرچوار لای کەسێتی مرۆڤ بگرێتەوە بە هاوسەنگی .

بەڕاستی پشت گوێ خستنی هەر لایەکیان دەبێتە هۆی تێکچوونی شیرازەی پەروەردە و پێنەگەیشتنی بەری دروست . بۆ نموونە : ئەگەر گرنگی درا بە فێربوونی زانست و کەمتەرخەمی کرا لە گەشەپێکردن و زیندکردنی باوەڕی کەسێکدا ، لە ئەنجامدا کەسێک دەردەچێت، بەراورد کردنی زۆر دەبێ، دەق زۆر لەبەر دەکات، زۆر دەدوێ لە بەما بالاکان و ڕێباز و ڕاتا بەرزەکان، بەڵام دەبینی لە بەرامبەر یا لە واقیعدا ڕەنگ وتەکانی نیە، باسی دادپەروەری و یەکسانی دەکات ، بەڵام لەگەڵ خەڵکیدا بە گوێرەی ئەم بەهایانە مامەڵە ناکات، بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەی کە ئەم بەرپرسیانە، باسی زوهد دەکات لەگەڵ گرنگی کارکردن بۆ قیامەت بەڵام دەبینی خۆی هۆگرە لەسەر کۆکردنەوەی سامان و زۆر بە کەمی و زەحمەت لێیدەبەخشێت، هەموو شتێک زۆر ورد دەکاتەوە با زۆر بچوکیش بێت .. ئەمەش هەمووی بە هۆی گرنگی نەدان بە باوەڕ بە پلەی گرنگیدان بە فێربوونی زانست ، ئەوەی ماوەی وتە و کردار دڕێک دەخاتەوە ، وە تەرجومەی زانست دەکات بۆ ڕەفتار بریتی یە لە : { وزە و هێزی گیانی پێکهاتوو لە باوەڕ. }

وە ئەگەر گرنگی دا بە باوەڕ بەبێ زانست و تێگەیشتن، دەبینی کەسێکی نەفام دەردەچێ، توند دەبێ لەوانەی کە نابێ توندی تیا بکرێ، وە شلی دەکات لەوانەی کە نابێ شلی تیا بکرێ، دەبینی کەسێکی ئاسۆ تەسکە و ناتوانێ لەگەڵ واقیع و تازەگەریەکانی سەردەمدا مامەڵە بکات[1] .

---

[1] نموونەی ئەو قەشەیەی کە کابرا کوژەری (٩٩) کەسە کە پرسیاری لێدەکات: ئایا ئەگەر تەوبە بکەم خوا لێم خۆش دەبێت ؟ لە وەڵامدا دەڵێت نەخێر !

وە لە بارێکدا ئەگەر گرنگی دا بە زانست و باوەڕ و گرنگی نەدات بە دەروون وخاوێنکردنەوەیی پشت گوێ خست ، لە ئەنجامدا کەسێکی زانا و پەرستش زۆر دەردەچێت، پێشبڕکێ دەکات لە کاری خێر و خەباتکردندا، بەڵام دەبینی کەسێکی فوتێکراوە ، سەیری خۆی دەکات بە وردبینییەکی گەورەکار، بەڵام بە پێچەوانەوە سەرنجی خەڵکی ئەدات، چونکە زۆری پەرستشەکانی و ویردەکانی و بەخشینەکانی خۆراکی باوەڕ بەخۆ و تواناکانی دەدەن و فوی تێدەکەن و وایلێدەکەن کە خۆی لە خەڵکی بەباشتر بزانێ وە بە بەسەربردنی ڕۆژان و بەردەوام بوونی سەرکەوتنەکانی ئەخۆشی لەخۆبایی بوونی تیا جێگیر دەبێ لە دوایشدا بەخۆنازین و خۆبەزلزانین پەنا بەخوا، خۆی دەخاتە بەر هەڕەشەی خوا و سوتانی کردەوە چاکەکانی.

وە ئەگەر گرنگی دا بە پەروەردەی دەروون و کەمتەرخەمی کرد لە پەروەردە بوونی ئیمانی دروست، لەوانەیە کەسێکی زۆر بە گلەیی و ڕەخنە لەخۆگر و بە پەژارە بۆ باری خۆی و زۆر باسی خۆی و چالاکییەکانی دەکات، بەڵام ناتوانێ واز بێنێ لەوەی کە خەم و پەژارەی ئەداتێ، چونکە ئەو هێزی نیە کە پاڵنەر بێ بۆ پاراستنی دەروونی لە لادان، کە ئەویش هێزی باوەڕە .

وە ئەگەر گرنگی دا بە پەروەردەی زانستی و باوەڕ و دەروون بەڵام گرنگی نەدا بە جوڵە و تێکۆشان لە ڕێی خوادا ! بانگکردنی خەڵك بۆلای خوا وفێرکردن و تێگەیاندنیان لە باوەڕ و ئیسلام، دەستکردنیان بۆ گۆڕینی دەروونیان بە ئیزنی خوا، ئەو کەسە بە دڵنیاییەوە توشی خاوبونەوە و تەمەڵی دەبێ، ئەو کاتە وایلێدێت کە لە نهێنی مانا و مەبەستی زۆرێك لەوەی فێربووە تێنەگات، ئەی چۆن وایلێناکات کە ئەو ئەوەی کۆیکردۆتەوە بەکاری ناهێنێ بە کردار ، ئەمەش وەك بیرێکا کە

رازی لێبهێنرێ و ناوی لێدەرنەهێنرێ ئاوەکەی دەگەنێ و دادەچێ و وشك دەبێ، (سید قطب) لە تەفسیری(فی ظلال القرآن)دا (ل٢٠٣٨) دەڵێت : " بە دڵنیاییەوە راستێتی قورئان هەرگیز ئاشکرا نابێت بۆ ئەوانەی کەنارگیرن"

وە هەروەها رەنجدان و تێکۆشان و خەباتکردن لە ڕێی خوادا بەبێ توێشووی بەردەوام بە دڵنیاییەوە تووشی ئەنجامێکی خراپ و بە زیان دەبێت، بۆ خستنە رووی ئەم مەترسیە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بەسە : {مَثَلُ الذي يُعلِّمُ النّاسَ الخيرَ ، و ينسى نفسَهُ ، مثلُ الفتيلةِ ، تُضيءُ للناسِ ، و تَحرِقُ نفسَهُ} رواه الطبراني .

کەواتە هاوسەنگی لە نێوان ئەم دووڵادا زۆر پێویستە : دەبێ تێشو هەبێ، وە دەبێ بڕواندنیش هەبێ بەم توێشووە، ئەمەش کەسی لێ جیاناکرێتەوەتەنانەت پێغەمبەریش(ﷺ)، ئەوەتا خوای گەورە ئاراستەی دەکات :﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾الشرح/٧ . واتە : هەر کاتێك لە کارێکی خێر بوویتەوە بە شەونوێژ و یادی خوا گیانت بە نووری خوا شەحن بکەرەوە ئەگەر سەرنجی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بدەین بۆمان روندەبێتەوە کە چەندە گرنگی داوە بە خەبات و تێکۆشان لە ڕێی خوادا و کۆکردنەوەی توێشوی ڕێگا بە بەردەوامی هەروەها یاران و شوێنکەوتووە راستەقینەکانی.

دەبینین تا ئاستێکی زۆر بەرز ئەم فەرموودەی خوا رەنگی داوەتەوە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩

وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ ۚ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي
الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن
قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى
النَّاسِ ۚ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ
مَوْلَاكُمْ ۖ فَنِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴿٧٨﴾ ﴾ الحج ٧٧-٧٨ .

واته : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە کڕنوش و سوژدە بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن له هەموو بارو دۆخێکدا و تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفراز و سەرکەوتوو بن ، هەروەها بەردەوام بن له خەبات و جیهادو هەوڵ و کۆشش له پێناو خوادا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی .

پێشەوای نوێخواز ئیمام حسن البنا دەفەرموێ : خوای پەروەردگار بە کورتی کاری موسڵمانی ڕاستی لەم دوو ئایەتەدا خستۆتە ڕوو .. ئەمە وتەیەکی ڕونە و هیچ لێڵی و نادیارییەکەی تێدا نیە ، خوای گەورە فەرمانی کردووە بە موسڵمانان کە رکوع و سوجدە ببەن و نوێژەکان بەجێ بهێنن، بەگوێرەی توانا کاری چاکە بکەن .. ئەمەش ئەرکی هەموو تاکێکی موسڵمان کە پێویستە خۆی پێیهەڵسێ بە تەنها یا بە کۆمەڵ ، له پاشا فەرمانی پێکردون کە خەبات بکەن له ڕێی خوادا بە باشترین و ڕاستترین شێوەی خەباتکردن، بە بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی و فێرکردنی خەڵکی.

خوای گەورە نهێنی ئەم ئەرکە و دانایی ئەم فەرزەی ڕونکردۆتەوە . ڕوتی کردۆتەوە بۆیان کە خوای گەورە هەڵیبژاردون . تاکو ڕێبەری خەڵکی بن، وە باوەڕپێکراویان بن لەسەر شەریعەتەکەی. وە میراتگری رسول الله بن لە بانگەوازەکەیدا، ئەمەش ئەو ئەرکە کۆمەڵیەیە کە خوا سپاردویەتی بە هەموو موسڵمانان کە یەک ڕیز بن ، یەک پارچە و یەک هێز ، وە ئەوان ئەو لەشکرە بن کە مرۆڤایەتی ڕزگار بکەن و ڕێنماییان بکەن بۆ سەر ڕێگای ڕاست.

لە پاشا پەروەردگاری بڵند بۆ خەڵکی ڕونکردۆتەوە . پەیوەستی نێوان ئەرکی تاکی لە نوێژ و ڕۆژوو. وە ئەرکی کۆمەڵی . وە یەکەیان هۆکارە بۆ دووەم وە بیروباوەڕی ڕاست و دروست بنچینەی هەردوکیانە ، تاکو پاساو نەبێت بۆ کەسانێک کە حەزیان لە دانیشتن و نەکردنی فەرزە تاکیەکان بێ بە هۆی ئەوەی خەریکی کاری کۆمەڵین، وە تاکو پاساویش نەبێ بۆ نەکردنی کاری کۆمەڵی لەلایەن کەسانێکەوە کە حەزیان لە نەکردنی کاری کۆمەڵیە بە بیانوی ئەوەی ئەوان خەریکی پەرستشن و ڕۆچوون لە پەیوەندییان بە پەروەردگاریانەوە

– جیاوازی نێوان فێرکردن و پەروەردە کردن :

جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان فێرکردن و پەروەردە کردندا :

- ئامانجی فێرکردن گەیاندنی زانستەکەیە بە قوتابی و وەرگرتنی و تێگەیشتنی بەبێ چاوەڕوانی پەیڕەوی کردن .
- بەلام ئامانجی پەروەردەکردن گەیاندنی زانستەکەیە و تێگەیاندنی لەگەڵ ڕاهێنانێکی بەردەوام لەسەر مانا و مەبەستەکانی تاکو کاریگەرییەکی هەمیشەیی دروست دەبێت لەسەری و گۆڕانکاری لە ڕەفتاریدا بەرهەم دێت و مانا و مەبەستەکانی بەجێ دەهێنێت

لێرەوە تێدەگەین لە گرنگی پەروەردەی ڕاستو دروست کە ئامانجێتی پێگەیاندنی تاکی موسڵمانی چاکو چاکەخواز، لەبەر ئەمەشە گرنگترین ئەرکی پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت) : {پەروەردە و پاکژکردنەوەیە} .

﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ۝﴾ الجمعة/٢.

واتە: هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروونو ڕواڵەتو ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گومڕایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو.

**(٢) باوەڕ :**

بریتی یە لە فێربونو تێگەیشتن لە ڕێگەی زیرییەوە ، ئینجا بە ڕاست زانین بەدڵ و دەربڕینی بە زمان و سەلماندنی بە کردەوە.

بەڵێ باوەڕ وشەیەکی گشتی یە، هەموو بەڕاستزانین و دڵنیابون و متمانە پێکردنێکی دڵی دەگرێتەوە بە هەرچ شتێك کە زیری پێی قایلبێ ئەگەر بیرێکی پڕچیش بێت.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ۝﴾ النساء/٥١ .

واتە : ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی کە بەشێك لە کتێبی ئاسمانی پێدراوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە فاڵچی و جادوگەر و بت و پەیکەر و شەیتان و ... هەیە و دەربارەی ئەوانەی کە بێباوەڕن و دەڵێن : ئەوانە چاکترن و ڕێبازی ڕاستریان گرتووە تا ئەوانەی باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هێناوە .

﴿... أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾ النحل ٧٢ .

واتە: ... لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا ئایا ئەوانە هەر بڕوا بە شتی پوچ و ناحەقی دەکەن و لە بەرامبەر ناز و نیعمەتەکانی خواوە ئەوان هەر ناشوکر و بێباوەڕ دەبن.

بۆیە قوربانیدانێکی مەزن ڕوودەدا لەلایەن هەندێ لە هەنگرانی بیروباوەڕە دنیاییەکان لە پێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان و بەرز کردنەوەی ئاڵاکەیان، ئەمەش بە هۆی هێزی باوەڕیان بە بیرو باوەڕەکەیان.

بەڵێ لێرەدا باسمان لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامیە بەتایبەت چەمکی باوەڕ بەخوا .

باوەڕ بەخوا :

واتە:ناسینی خوا لە ڕێگەی دروستکراوەکانی و ناوە جوانەکانی و ئەوەی کە خۆی پێناساندووە بە ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، لە پاشان بەڕاستزانینی بەدڵ و متمانەو دڵنیابون بە تواناي رەهای و راونستاوێتی و هەمیشە نەمری و هێزی لەبن نەهاتوی و ئەو زانیاریەی کە هەموو شێکی گرتۆتەوە و داناییە مەزنەکەی ...

دەبێ ئەوەشمان لا ڕوون بێ کە باوەڕ بە شێکی تایبەت بۆ خوای بڵند و باڵایە دەیبەخشێ بەر کەسەی ئارەزوی دەکات و ئامادەیە بە وەرگرتنی :

﴿... وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ۝ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ۝﴾ الحجرات/٧-٨ .

واتە : ... بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردوون و لە دڵ و دەروونتاندا رازاندویەتیەوە .. لەولاشەوە کوفر و بێ باوەڕی و گوناهو و یاخی بوون لە فەرمانی خوای لا تاڵ و ناشیرین کردوون، ئا ئەوانە هەر خۆیان رێگەی ژیری‌و سەرفرازیان گرتۆتە بەر ، ئەمەش خۆی رێز و بەخششێکی تایبەتی و نیعمەتێکە لەلایەن خواوە پێیان دراوە خوایش زانا و دانا و کاربەجێیە .

تایەتی یەکەم : کۆتایی دێت بە (أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ) .. واتە: ئەوانەی کە ژیریان بەکار هێنا ، بەکارهێنانێکی راست لە گەڕان بەدوای راستیدا .

رە تایەتی دووەم: کۆتایی دێت بە (وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ) واتە خوای پاك و بڵند و زانا دەزانێت کێ شایەنی ئەم بەخششەیە ، وە دانایە لە بەخشینیا، کاتێ دەبینێ کەسێ ئامادەیە بۆ وەرگرتنی پێی دەبەخشێ

﴿... وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ النور/٢١ .

واتە: ... بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێت و شایستە بێت پاکو پوختەی دەکات‌و لە گوناهەکانی دەبورێت ، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە .

پێویستە ئەوەش بزانین کە کەس ناتوانێ بە هەوڵی خودی خۆی وەدەستی بێنێ : ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ یونس ١٠٠

سوننەتی خوا بۆ وەرگرتنی هیدایەت ئەوەیە کە مرۆڤ ئارەزوومەندی هیدایەت بێ و تواناکانی بخاتە گەڕ و ئامادەبێ بۆ وەرگرتنی ئەوە ئەنجامەکەی بە ویستی خوا دەبێتە بارەڕ ، وە بە پێچەوانەوە ، ئەو کەسانەی کە ژیرییەکەیان دەوەستێنن و سود لە تواناکانیان وەرناگرن ، (ئەنجامەکەی دەبێتە گومڕایی) .

خوای گەورە لەم فەرموودە قدسییەدا دەفەرموێت : (( يا عبادِ كُلّكم ضالٌ الا مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ )) اخرجه مسلم، ج٤، ل١٩٩٤ ، ژمارە(٢٥٧٧) .

هەروەها دەتوانین سودێکی زۆر وەرگرین لە کۆمەڵە ئایەتێکی قورئان بۆ تێگەیشتن لەم مانایە ، وەك ئایەتی (٥٣) سورەتی الانعام : ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا ۗ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾ . لەم ئایەتەوە تێدەگەین کە دڵی ئەوی بۆ خوانەویکردنەکەی پێشوازی کردنە لە دیارییەکەی خوا بە مەمنونی و سوپاسەوە ، وە لەبار و ئامادەیە بۆ وەرگرتنی ، کاتێ راستی دەخرێتە بەردەم ژیرییەکەی قایلدەبێ پێی، ئەمەش تەواو بە پێچەوانەی ئەو دڵەی کە سپڵە و پڕ لە ئەزان و خۆبەزلزانە :

﴿سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ الرُّشْدِ لَا

يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً وَإِن يَرَوْا سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ﴾ الاعراف/١٤٦ .

واته: بەم زوانە ئەو كەسانەی كە بە ناحەق لەسەر زەويدا ملهوڕی و خۆبەزلزانی دەنوێنن، لە ڕێبازی بەڵگە و نیشانەكانی خۆم لایان دەدەم، ئەگەر هەموو نیشانەكانیش ببینن، ئەو ڕێگایە هەڵنابژێرن . بەڵام ئەگەر ڕێگای چەوت و هەڵە ببینن، دەیكەن بە ڕچە و ڕێباز ، ئەوانەش بێگومان هۆكارەكەی ئەوەیە، نیشانەكانی ئێمە بە درۆ دەزانن ، بەردەوام لێشیان بێئاگان .

**( ب ) تەوەرەكانی پەروەردە :**

## یەكەم : ژیری و پەروەردەی زانیاری . .

- ژیری : بریتی یە لە جێگای فێربوون و وەرگرتنی زانستی، لە پێناو جوان تێگەیشتن لە ژیری ، تیشك دەخەینە سەر ئەم خاڵە كە ڕاستەوخۆ ڕوو لە مرۆڤ دەكات؛ بەڵێ لەگەڵ پەرستشی هەموو بونەوەر بۆ خوای تاك و تەنها و ستایشی بەردەوامیان بۆی ؛ ویستی پەروەردگار وابوو دروستكراوێكی تازە لە گڵ بەدیبهێنێ و سەرپشكی بكات لە پەرستنی خوادا دوای ئەوەی كە ژیرییەكی بێ وێنەی پێ بەخشی لەگەڵ بەهرە و توانست وبلیمەتی و بنەماكانی ژیان، تا لە میانەیاندا بكات بە ناسینی خوای بالادەست ، بە پلەیەك كە هیچ بەدیهێنراوێكی تر نەیكاتی ، تەنانەت فریشتەكانیش ، وە لە تەنیشت ئەم ژیرییەشەوە نەفسێكی پێدا كە حەزی لە ئارەزووەكان بێت و گوێ تەدا بە ئەنجامی فەرمانەكان .. خوای بالادەست ڕێزێكی

تایبەتی بەخشی بەم دروستکراوە تازە کە مرۆڤە و فەرمانی کرد بە فریشتەکانی کە سوجدەی ڕێزی بۆ ببەن ، هەموو سوجدەیان بۆ برد تەنها شەیتان نەبێ کە بەهۆی خۆبەزلزانینەوە سوجدەی نەبردو بووبە دوژمنێکی سەرسەختی ئەم مرۆڤە و وەچەکەی، بۆیە خوای گەورە مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە لەم دوژمنە :

﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ فاطر/٦.

واتە: بێگومان شەیتان دوژمنتانە ، ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن، بێگومان بانگی پارتەکەی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ .

خوای گەورە ژیری بەخشیوە بە مرۆڤ ، ژیرییەك کە ژمارەیەکی زۆر لە کەلێن- خانەی تێدایە کە هەڵدەستن بە وەرگرتن و بەدەبارکردنی زانیارییەکان، توێژینەوەیەکی زانستی سەلماندوویەتی کە ژمارەی خانەکانی مێشك دەگەنە نزیکەی (٣٠٠)بلیۆن خانە، ئەم خانانە لە توانایاندایە نزیکەی (١٠٠) بلیۆن زانست وەربگرن، وە ئەو پەڕی ئەوەی مرۆڤ بەکاری دەهێنێ لەم لێهاتنە (١٠٪)ی تێناپەڕێ .

لە بنەڕەتدا خوای گەورە ئەم ژیرییەی بەدیهێناوە بۆ ئەرکێکی مەزن کە پێویستە لێوەی بڕوانێتە جیهانی جۆراوجۆری دەوروبەری ، وە بە تایبەت خودی خۆی کە پێکهاتووە لە ڕێنەیەکی بچووککراوەی پەڕاوی بوونەوەر تا لێوەیان پەروەردگاری خۆی بناسێ : ﴿وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَـٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ۝ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ۝﴾ الذاريات/٢٠-٢١

واتە: بێگومان لەسەر گۆی زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە لەسەر دەسەلات و زانیاری خوا بۆ کەسانێک کە بە شوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن هەروەها لە خودی خۆشتاندا، ئایا ئەوە بۆ بیناییتان ناخەنە کار.

• بۆچ بە پەروەردەی زانست دەستمان پێکرد :

بەڵێ بە زانست دەستمان پێکرد چونکە زانست سەرەتایە : ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾محمد/١٩. زانست بنچینەی کارکردنە ، وە ئەگەر ژێری جێگای زانست و فێربونە، بە دڵنیاییەوە ئەو زانستە راستەقینەی کە پێویستە بەندە خەریکی بێت بە فێربونیەوە بریتی یە لە زانستی ناسینی خوای بەرز و بڵند کە لە میانەیەوە بەندایەتیکردنی راستەقینە بۆ خوای پاك و بێگەرد جێبەجێ دەکرێت، کاتێك بەندە پەروەردگاری خۆی ناسی : خۆشی دەوێ ، ترسی لێ دەگرێ ، شەرمی لێدەکا، گوێڕایەڵی دەبێ، پشتی پێ دەبەستێ ... لە ئەسەر دا هاتوە کە موسی پێغەمبەر (علیه السلام) پرسیاری لە پەروەردگاری کرد ووتی: "ئەی پەروەردگارم، کام بەندەت بە شەرمترینە لێت؟ لە وەڵامدا فەرموی زاناترینیان بە من" أخرجه الدارمي(٣٦٦) .

وە پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾ فاطر /٢٨ .

واتە: بەڕاستی زاناکان پەی بەو نهێنیانە دەبەن و لە ناو بەندەکانی خوادا هەر ئەوان لە خوا دەترسن، بەڕاستی ئەو خوایە زۆر باڵادەستە و زۆریش لێخۆشبووە .

لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت :

( أ ) بەسودترین زانست ئەوەیە کە یەکتاپەرستی بهێنێتە دی لە گوفتار و کرداردا ، وە ببێتە هۆی چاککردنی مامەڵە کردن لەگەڵ خوای بەرز و بڵندا و لێترسان و ملکەچی و خۆشویستنیو گەڕانەوە بۆلای و جێگیربوون لەسەر ڕێ ڕاستەکەی، ئەمەش باشترین کارئاسانی بۆ فێربوون بێنێتە کایە :

﴿... وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ...﴾ البقرة/٢٨٢ .

واتە : پارێزکار بن خوا فێری ئەو شتانەتان دەکات .

پێغەمبەر (ﷺ) نزای دەکرد و دەیفەرموو : {أعوذ بالله من علم لا ينفع ، ومن قلب لا يخشع } وە لە فەرمودەیەکی تردا : { سلوا الله علما نافعا ، وتعوذوا بالله من علم لا ينفع} صحيح جامع الصغير(٣٦٣٥).

(ب) گرنگی بیرکردنەوە ، ئای کە چەندە پەرستشێکی مەزنە و پێویستە لە، رمان بەردەوام بین لەسەری تاکو لە میانەیەوە پەنر رەکانی ژیریمان بکرێتەوە ، گۆزەپانی سەیرکردنمان فراوان ببێ ، وە بە شوێنیا پلەی ناسینی خوا بەرز بێتەوە .

- لە ئامانجەکانی پەروەردەی زانستی :

١. گەشەکردنی ژیریو فراوانبونی پێزانینەکانی و کردنەوەی کەلەبەرەکانی.

٢. وەدەستهێنانی خۆرەسی لەبیرکردنەوە لە هەموو شتێ کە ڕوودەدا لە دەوروبەر و پەند لێوەرگرتنی .

٣. لە میانەیدا ناسینی خوای بەرزو مەزن و گەڕانەوە بۆلای .

٤. چاککردنی مامەڵە لەگەڵ خوادا .

٥. پێکهێنانی ئەو ژیریتیەی کە :

(أ) پێزانینێکی راستی هەبێ بۆ تێڕامانی راست و هەڵە .

(ب) تێبگات لە ئیسلام تێگەیشتنێکی دروست و وایلێبکات کە چەکی بیرکردنەوەی بێ .

(ج) سەربەخۆ بێ لە جێبەجێکردندا .

( د ) تێ بگا لە کۆمەڵگا و بتوانێ کێشەکانی دیاری بکا و چارەسەری بۆ دانێ .

- ڕێگای وەرگرتنی زانیاری و جێگیر بوونی :

بەڵێ هەر زانستێك مرۆڤ وەری دەگرێ لە میانەی بینینی یان بیستنی یا هەستەکانی تری ، زۆربەیەکەی پێشوازی لێدەکات بەو بەشە پێزانە هۆشیارە کە زانایان ناوی دەبەن بە (الشعور) ئەم زانیاریانە ناتوانن پاڵنەرێکی بەردەوام بن بۆ کارپێکردن تاکو نەبن بە زانیارییەکی جێگیر لای مرۆڤەکە ، ئەمەش بەوە دەبێ کە ئەو زانیاریانە بگوێزرێنەوە بۆ بەشێکی تری ژیری کە زانایان ناوی دەبەن بە (اللاشعور) واتە ناوچەی زانستی جێگیر ، یا دڵنیایی یا بیروباوەڕ، یا ژیری ناوەکی یا شاراوە ، ئەمەش بە دەربڕینی قورئان : ﴿وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴾طه/٧ . ئیتر زانیارییەکە ڕاست بێت یا چەوت ، پێویستە بۆ جێگیر بوونی ڕۆشتنی بە ژیری پێزاندا چەندجارە ببێتەوە و بێبات بۆ بەشی( اللاشعور) تا جێگیر دەبێ تیایدا .

بەڵێ بەشی ( اللاشعور) یا شاراوە ( الخفي) لە ژیریدا ناوچەی زانستی جێگیری دڵنیاییە لای مرۆڤ وە لە میانەیدا کردارەکان رادەبن بە شێوەیەکی خۆڕسکی ، قورئان نمونەی کەسانێکی هێناوە وایاندەزانی چاکەخوازن و چاکە دەکەن بەڵام رەفتار و مامەڵەیان

پێچەوانەی وتەکەیان بوو .. ئەزانن بۆ ؟ چونکە ئەوان بیری خراپ و گەندەڵ جێگیر بووبوو لە (لاشعور) یانداو بە راستیشیان ئەزانی و لە میانەیەوە گەندەڵیان ئەکرد بە ڕێگایەکی خۆڕەسی لە (لاشعور) ەوە :

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ۝ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ۝﴾ (البقرة: ١١-١٢).

واتە: ئەوان کاتێ پێیان دەوترێت گەندەڵی مەکەن لە زەویدا، دەڵێن بەڕاستی ئێمە تەنها چاکسازی دەکەین، ئاگادار بن، کە بە ڕاستی هەر ئەوانە گەندەڵکارن بەڵام هەستی پێناکەن.

بەڵێ وەرگرتنی زانیاری و چەند بارەبوونەوەی تا جێگیر دەبێ لە ژێری ناوەوەدا دەبێتە هۆی رایونی کردار بە خۆسەری ، بۆ نمونە :

- ئەو کەسەی کە فێری شۆفێری دەبێت ، بە ڕێگای هەستیاری(شعور)فێر دەبێ، لە پاشا بە بەردەوام بوون و ڕاهاتن و بەجێهێنان ؛ زانستەکان جێگیر دەبن لە ژێری ناوەکیدا کە وایلێدەکات بەبێ بیرکردنەوە سەیارەکەی لێخوڕێ .
- ئەو کەسەی کە دەیەوێ فێری نوسین ببێ لەسەر کۆمپیوتەر ، لە سەرەتاوە بەبێ سەیر کردنی جێگەی پیتەکان ناتوانێ بنوسێ ، وردە وردە فێر دەبێت تا وای لێدێت دەنوسێ بەبێ ئەوەی سەیری جێگەی پیتەکان بکات ..

لێرەدا گرنگی بەجێهێنان و ڕاهاتنی کردارێمان بۆ دەردەکەوێ ، وە ڕاستی مانای ئەم وتەیەمان بۆ دەردەکەوێ لە پشتگیری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گرنگی بەردەوام بوون با کەمیش بێ ، بەم فەرموودەیە : { عن

عائشة ، قالت: قال رسول الله (ﷺ): " أحب الأعمال إلى الله تعالى أدومها ، وإن قل " متفق عليه أخرجه البخاري (ج٥/٢٣٧٣ رقم ٦١٠٠) و مسلم (ج١/٥٤١ رقم ٧٨٣).

بۆ نموونە:

ئەگەر درایت لەگەڵ کەسێکدا لە بارەی ڕۆژییەوە کە بەدەست خوای باڵادەستە و ئەو بۆی مسوگەر کردوین، دوای ئەو ڕوونبوونەوەیە قایلبوونی لێدەبینی، بەڵام لەکاتی جێبەجێکردندا لە جەنگی ژیاندا فەرمانەکە دەگۆڕێ و بە جۆرێکی ترە ! هەڵپە و هۆگری لەسەر ماڵ و زۆر بیرکردنەوە لە داهاتوو، ترسی هەژاری .. لێدەبینی، بۆیە چارە گۆڕانی ڕەفتارەکەیە، ئەمەش بە گۆڕانی ئەوەی کە جێگیر بووە لە بیروباوەڕی هەڵە و گۆڕینی بە بیروباوەڕی ڕاست و وەرگیراو لە سەرچاوەی ڕاستەوە کە ڕاستترینیان سەرچاوەی وەحی و ژیاننامەی پێغەمبەرە (ﷺ) وە ئەم گۆڕانەش سێ هەنگاوی دەوێ :

(١) قایلبون :

بەڵێ! قایلبوون بە بیرێك هەنگاوی یەکەمە لە ڕێگەی گۆڕاندا، بە شێوەیەك ژیری پێزان دوای وەرگرتنی بیرەکە ڕێگا دەدا بە ڕێکردنی بۆ ژیری ناوەکی تاکو ڕەفتاری لێدەربڕاوی لێدەرچێ بە شێوەیەکی خۆڕەسی(تلقائي)، لێرەوە دەردەکەوێ ڕێزلێنانی قورئان بۆ ژیری و بەردەوام دواندنی و قایلکردنی بە گرنگی بیرە پێشنیارکراوەکە ، خوێنەری قورئان بە لێکۆڵینەوەوە دەبینێ خوای گەورە و بلند ژیریمان دەدوێنێ و زۆرێك لەو شتانەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە دەیەوێ قایلمان کات بەوەی کە دەیەوێ لێمان ، بەڵکو لە قورئانەکەیدا بانگمان دەکات بۆ بەکارهێنانی ژیریمان و بیرکردنەوە لە فەرموودەکانی، وەکو ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا

تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِي بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ الأحقاف/٤.

له هۆكارەكانی قورئان بۆ قایلكردن :

١. نمونه هێنانەوە : ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ الزمر/٢٧.

واتە: بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە نمونەیەكمان بۆ خەڵكی هێناوەتەوە ، بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و بیریك بكەنەوە له ڕاستیەكان و تێ‌بگەن.

لەو نمونانەش : ئەو نمونە قورئانیەی كه مەترسی مەرایی، دڵسۆز نەبون بۆ خوا دەخاتە ڕوو لەگەڵ چۆنیەتی باری خاوەنەكەی كاتێ نەبینێ بەرهەمی خەبات و ماندو بونەكەی له ناو چووە له كاتێكدا زۆر پێویستی پێیەتی : ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ البقرة/٢٦٦.

واتە: ئایا هیچ کەس لە ئێوە حەز دەکات باخێکی هەبێت لە دارخورما و جۆرەها رەزەتری جۆگە و رووبار بە ژێر درەختەکانیدا بڕوات و هەموو جۆرە بەروبومێکی تێدا بێت بۆ خاوەنەکەی، خۆی دووچاری پیری بووبێت و چەند نەوە و منداڵێکی لاوازی هەبێت، کەچی لەناکاو گەردەلولێکی گڕاوی بەهێز هەڵکاتە سەری و یەکسەر بسوتێت؟! ئابەو شێوەیە خوا ئایەت و بەڵگە و نیشانەکانی دەخاتە بەرچاوتان بۆ ئەوەی تێفکرن و بیربکەنەوە.

ب ـ گرتنە بەری رێگای دەرەنجام و لێتێگەیشتن بە ئاراستەکردنی پرسیار و وەڵامدانەوەی لەلایەن ژێربیەوە بۆ گەیشتن بە واتای مەبەست وەکو :

﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ص/٢٨.

واتە: ئایا رەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوەچاکەکانیان ئەنجام داوە ، وەک ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزکار و لەخواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

(٢) چەندبارەکردنەوەی بابەتەکان بۆ جێگیربوونی بابەتەکە :

کاتێک قایلبون بە بیرۆکەیەک روودەدا لە ساتێک لە ساتەکاندا ، دەبینی قایلبووەکە بە کردارێک لە کردارەکان قایلبونەکەی دەردەبڕێ ، وەک ئەو کەسەی قایلدەبێ بە گرنگی یارمەتدانی هەژاران بە رێگای خوێندنەوە

یا بیستنەوە، لە پاشا کە دەگات بە هەزاری پارەتییەکی دەدا یا کەمیش بێ، لەوانەیە ئەم کردارە دووبارە نەکاتەوە مەگەر بەردەوام ناو بەناو گرنگی بەخشینی یاد بخرێتەوە: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ الفرقان: ٥٠.

صَرَّفْنَٰهُ: واتە: دووبارەمان کردۆتەوە بە شێوازی جۆرو جۆر.

وە لە سوودەکانی دووبارە کردنەوە؛ خوێنەر یا بیسەر والێدەکات لە بارێکی هەمیشەییدا بێت لە یادەوەری و بیداری، لێرەدا یاسای دووبارەکردنەوە دەردەکەوێ وەکو هۆکارێك لە هۆکارەکانی بنیاتنانی قایلبونی دروست کە قورئان بەکاری دەهێنێ زیاتر لەلایەنەکانی رێنموونی(هدایة)دا.

- واتای رێنموونی: شارەزابوونی رێگای راست بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە مرۆڤ هەوڵ دەدات بیگاتێ؛ کە پەرستشی خوای تاك و تەنهایە و رازیکردنیەتی و چونە بەهەشت.
- لەو لایەنانەش:

(١) ناسینی خوای بڵند و باڵادەست، پانتاییەکی مەزنی گرتۆتەوە لە قورئاندا، بەشێوەیەك نایەتێك نابینی کە پێناسەی خوای پاك و بێگەرد و مافەکانی لەسەرمان لە پەرستشی دڵی و لایەنەکانی شەرعی تێدا نەبێ. ناسینی خوای گەورە بە سیفات و ناوەکانی و کردارەکانی بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ببنە بەندەیەکی راستی خوای گەورە، ئەوسا دەبنە خاوەن ئازادییەکی راستی.

(٢) پێغەمبەر و پەیام : ناساندنی پێغەمبەران (علیهم السلام) و پەیامەکانیان بە تایبەت محمدی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەو پەیامەی هەڵی گرتووە بۆ ئادەمیزاد :

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ .... ﴾ الكهف/١١٠ .

واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ)پێیان بڵێ : بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت .

(٣) پێناسەی مرۆڤ :

خوای بەدیهێنەر و مەزن مرۆڤی بەدیهێناوە و پێکیهێناوە لە ژیری:﴿...إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾الرعد/٤ . و دڵ:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾الأنفال/٢.

و دەروون :﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا﴾الشمس/٧ . و ئەندامانی لەشی .

(٤) ناساندنی شەیتان :

دوای ئەوەی ئیبلیس سوجدەی نەبرد بۆ ئادەم و سەرپێچی فەرمانی خوای کرد ، خوا لە بەزەیی خۆی دەریکردو ئەویش داوای مۆڵەتی مانەوەی کرد بۆ دژایەتیکردنی مرۆڤ و تۆڵەسەندنەوە : ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾فاطر/٦.

واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان بانگی پارتەکەی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ .

(٥) چیرۆکی بوونی مرۆڤ و ڕۆژی لێپرسینەوە :

خوای گەورە مرۆڤی بەدیهێناوە بۆ بەندایەتیکردن لەسەر زەویدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆی ڕام کردووەو ژیانی سەرزەوی بۆ کردوە بە تاقیکردنەوە و دوای مردن و زیندوبونەوەی لێی دەپرسێتەوە :

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات/٥٦ .

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ الملك/٢ .

﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ﴾ الأنبياء/٤٧ .

واتە: سروشتی ژیانی ئەم جیهانە کە هۆی تاقیکردنەوەیە کۆتایی دێت بە ڕۆژێکی گەورە بۆ پرسینەوە ، کردەوەکانی تیدا دەخرێتە ڕوو، ئەنجامەکان ڕادەگەیەنرێن، تاکو سەرکەوتوەکان بگەن بەو بەهەشتەی کە خوا بۆی ئامادەکردون و بەهرەمەند بن بە جۆرەها ناز و نیعمەت، وە کەوتوەکان بچن بۆ ئاگر تا جۆرەها سزای تیدا بچێژن .. خوا پەنامان بدات .

(٦) ئاساندنی ئەو یاساو سوننەتانەی کە خوا ژیانی پێ دەبا بەڕێوە

تاکو لەیادمان بێ و سودیان لێ وەرگرین : ﴿...فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ

ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴾فاطر/٤٣.

(٧) شارەزاکردن لەسەر جیهانی دەوروبەر:

ئێمەی مرۆڤ لەم بونەدا تەنها نین بەڵکو بەدیهێنراوێکی زۆر لە دیار و نادیار بە دەوروبەرماندان، قورئان ئەو بەدیهێنراوانانەمان پێدەناسێنێ لەگەڵ سروشتی پەیوەندیمان پێیانەوە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لە گەڵیاندا :

﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا﴾ البقرة/٢٩ .

وە ئەوانیش هەموو لەگەڵمان ستایشی پەروەردگار دەکەن :

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ

ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ الجمعة/١ .

(٨) مافی بەندەکان بەسەر یەکەوە:

بۆ ئەوەی ژیانمان بە خۆشی ببەینە سەر و هاوکارێکی باش بین بۆ یەکتری تا بتوانین سەرکەوتو بین لە ئەنجامدانی ئەرکی بونمان ، خوای گەورە کۆمەڵێ مافی داناوەبەسەرمانەوە بۆ یەکتری کە بە کورتی کۆدەبنەوە لە دادپەروەری و چاکەکردن و ستەم نەکردن لە یەکتری :

﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾ المائدة/٢ .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ النحل ٩٠ .

واته : بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێبگەن و هەمیشە چاکە بکەن .

(٩) شارەزاکردنی شێوازی بانگکردن بۆلای خوا :

بۆ ڕزگارکردنی ئەفامان و شوێنکەوتووانی ئارەزوو لە تاڵی و دەربەدەری ژیان و چوون بۆ دۆزەخ، خوای گەورە کردویە بە ئەرک بەسەر شارەزاکانەوە که بانگیان بکەن بۆ سەر ڕێ ڕاستەکەی خوا، لە قورئاندا ڕێنموویی کردووین بۆ چۆنیەتی ئەو بانگکردنە : ﴿ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ﴾ النحل ١٢٥ .

(١٠) شارەزا کردن لە چیرۆکی پێشینانمان:

تاکو پابەند و ئامۆژگاریان لێوەرگرین :

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ يوسف/١١١.

واتە: بەڕاستی لە سەرگوزشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند.

(٢) وێنەکردنی نەخشەی ئیسلام:

لە هۆکارەکانی جێگیرکردنی زانیارییە ڕاستەکان لە ژێری ناوەکیدا، وێناکردنی نەخشەی ئیسلامە لە هۆش و بیردا، قورئان بە ڕوونی و ڕاستی ئەم نەخشە وێنا دەکات لە بیری ئەو کەسەی پەنای بۆ دەبات و بە جوانی لێی ورد دەبێتەوە، تێڕامانێکی گشتی پێدەدات لەسەر هەموو ئەوەی داوای لێکراوە و پەیوەندی یەکانی بە هەموو شتەکانی دەوروبەریەوە، وە هەموو فەرمانەکانی بۆ داناوە بە قەبارەی گونجاویانەوە لە ڕەگەزنامەی ئیسلامدا، سەرنجی ئایەتەکانی (١٠-٢٢)ی سورەتی التوبە بدە، دەبینی کاروباری خەبات لە ڕێی خوادا مەیدانێکی شایانی وەرگرتووە لە قورئاندا و لە ڕیزبەندیشدا پێش پەرستشەکانی تر دەکەوێ لەکاتی بەریەک کەوتندا.

بەڵێ ئەوی ژێرەکەی بە قورئان بسپێرێ! دەبینێ کەسێتیەکی هاوسەنگی بۆ پێکدێنێت، توانستی ناسینی گرنگ و گرنگترین بۆ هەموو، بۆ هەموو کاروبارێ کە قورئان دەیخاتە پێش چاوی، چونکە قورئان لە بیری شوێنکەوتوانیدا نەخشەیەکی گشتی و ڕوون وێنا دەکات، گرنگی دەدات بە هەموو بەشێکی، شیاو بە قەبارەی خۆی .. بە هەموو ئەمانەش ڕاستکردنەوەی زانیاری و تێگەیشتن پێکدێنێ، وە وەرگیراوە جێگیربووەکان دەگۆڕێ تاکو مانا جوانەکانی قورئان جێیان بگرنەوە.

## دووەم : دڵ :

دڵ ئەو میهرە پەروەردگارییە گیانییە کە پەیوەندی هەیە بەو پارچە گۆشتە سنەوبەرییەوە کە دەکەوێتە لای چەپی سنگ ، ئەو ئامێری پێزانین و تێگەیشتنە لە مرۆڤدا ، کە دەدوێنرێ و داوایلێدەکرێ و سزا دەچێژێ و گلەیی ئاراستە دەکرێ، دڵ بنکەی ویست و بڕیاردانە لە ناوەوەی مرۆڤدا، پادشایە بەسەر هەموو لاشەوە و هەموو کردار و رەفتارێکی ئیرادی لاشە فەرمانی جێبەجێکردنی لە دڵەوە وەردەگرێت ، پێغەمبەری ئازدار (ﷺ) دەفەرموێ : [ألا إنّ في الجسد مُضغةً إذا صلحتْ صلُحَ الجسدُ كلُّهُ و إذا فسدتْ فسدَ الجسدُ كلُّهُ ألا و هيَ القلبُ] متفق عليه.

ئەم دڵە دەکەوێتە نێوان دووهێزی راکێشەرەوە:

١. هێزی ئارەزوو : ئەوەی دەروون حەزی پێدەکات .

٢. هێزی باوەڕ: دڵنیابوون بەو بیرو قایلبوونانەی کە لە ژێریدایە، لە کاتی بڕیارداندا بەهێزترینیان دەست دەگرێ بەسەر ویستداو ئاراستەی بڕیاردان دەکات بۆ بەرژەوەندی خۆی .

بۆ نموونە :

- کاتێ موسڵمانێك بانگی بەیانی دەبیستێ و دەزانێ کاتی لەخەو هەستانە بۆ ئەنجامدانی نوێژ ؟ لەم کاتەدا کێشمە کێشێك لە دڵیا روودەدات لە نێوان باوەڕ و ئارەزوویدا ، گەر هێزی باوەڕ سەرکەوت ئەوا هەڵدەستێ و نوێژەکەی ئەنجام دەدات بەڵام ئەگەر هێزی ئارەزوو سەرکەوت ئەوا هەڵناستێ و خەو ئەیباتەوە .
- گەر موسڵمانێك چاوی کەوت بە روخساری ئافرەتێکی نامەحرەم و چاوی دانەخست ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لەو کاتەدا ئارەزووی بەهێزترە لە باوەڕی بەخواو ملکەچ نابێ بۆ فەرمانەکەی بەچاو داخستن .

بەراستی باوەڕ ؛ پاڵنەرەبۆ ڕەفتاری ئیجابی و باش : ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ الحج/٣٢.

واتە: ئەوەی ڕێز دادەنێت بۆ دروشم‌و بەرنامەکانی خوا، ئەوە نیشانەی پارێزکاری‌و لەخوا ترسانی دڵەکانە.

چەندە باوەڕ بەهێز بێت ئەوەندە ڕەفتار چاك دەبێت بەخۆڕەسی، وە مەودای نێوان گوفتار و کردار نزیك دەبێتەوە، باوەڕ ئەو درەختە بەردارەیە کە بەری باش دەگرێت، باوەڕ خاوەنەکەی دەبزوێنێ بۆ بەخشینی ئەو بەری ئەوەی دەتوانێ بیبەخشێ لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگاریدا ، ئیتر ناسرەوێ، ماندو نابێ، بێزار نابێ لە گەیاندنی بانگەوازەکەی خوا، هەمیشە دەبینرێ پەلە دەکات لە کاری خێردا بە هەموو لایەکدا، باوەڕی زیندو بەرپەستی ئاوەکی بەهێز دەکات تاکو وەکو پاسەوانێکی بێدار چاودێری خاوەنەکەی بکات‌و پاڵێنێ بۆ چاکەکردن‌و دووری دەخاتەوە لە سەرپێچی و ئارەزووەکان، ڕێی پێنادا بەشداری بکات لە غەیبەت و دوو زمانی ... چەندە باوەڕ بەهێز بێت ئەوەندە چارەسەری کێشەکان دەبێت‌و کەم دەبنەوە لە نێوان باوەڕدارانذا.

بەڵێ ئارەزوش پاڵنەرە بۆ ڕەفتاری سلبی و خراپ : ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ﴾ القصص/٥٠.

واتە: ئەگەر بەدەم بانگەوازی تۆوە نەهاتن ، ئەوە چاك بزانە کە ئەوانە شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون.

واتای ئەمەش ئەوەیە گەر ! ئەو زانیاری‌وقایلبونانەی کە لە ژێریدا هەیە ئەوەندە دڵنیابون‌و باوەڕپێکردنی دڵی بۆ دروست نەکرد تاکو بتوانێ

بەرەنگاری ئەو ئارەزووەی ببێتەوە کە دژایەتی ئەو قایلبونانە دەکات، وە سەرکەوێ بەسەریدا، ئەو کاتە ئەم قایلبونانە تەرجومە ئابن بۆ رەفتارێکی کرداری وە لە پاشدا وتەی کەسەکە و قایلبونەکانی دەکەونە لایەك و رەفتاریشی لەلایەکی تر .

قورئان هەواڵمان دەداتێ کە کەسانێك هەن دان بە پەروەردگارێتی خوادا دەنێن بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شەرمی لێناکەن ملکەچی فەرمانەکانی نابن ئەمەش لەوە دڵنیامان دەکات کە دانپیانانەکەیان دانپیانانێکی ژێری روتە و باوەڕی پێکنەهێناوە لە دڵدا ( بۆ زیاتر تێگەیشتن سەرنجی ئایەتەکانی (٨٤–٨٧ سورەتی المؤمنون و ئایەتی (٣٧)ی سورەتی یونس بدە . )

هەروەها قورئان باسی کەسانێکی ترمان بۆ دەکات کە بە رونی دانەدەنێن بەوەدا کە ئیسلام رێنموییە ، بەڵام ناتوانن پەیڕەوی بکەن لە ترسی ژیان و بەرژەوەندییدا : ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ﴾ القصص/٥٧ .

واتە : دەیانوت ئەگەر ئێمە شوێن هیدایەت و بەرنامەی ئیسلام بکەوین لەگەڵ تۆدا لە وڵاتی خۆماندا دەفڕێنرێین و تووشی نەهامەتی دەبین ..

ئا لێرەوە گرنگی پەروەردەی ئیمانی دەردەکەوێت ! ئەگەر ئامانجمان لە پەروەردەی مەعریفی گەشەکردنی ژیری بێت بە زانستی بەسودی قایم و چەسپاو کە ئەویش زانین و ناسینی خوای بەرز و بڵندە بە دڵنیاییەوە ئامانجی پەروەردەی دڵ بەهێزکردنی باوەڕە بە زانستە و جێگیر کردنی تیایدا تاکو دەستی بەسەرا دەگرێ و سەروەرکاری دەکات وە ئارەزوی دادەمرکێنێتەوە و بەمەش بۆ ئەو کەسە بەندایەتیکردن ئاسان دەبێت بە شێوە جۆراو جۆرەکانیەوە .. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە گۆڕانی رەفتار بە

گۆڕانێکی راستی باش ، دەبێت بە چاکردن و سازکردنی دڵ بە باوەڕ دەستپێدەکات، بەکاتێ گۆڕانێکی خراپ لە رەفتاردا دەبینین! بە دڵنیاییەوە ئەوە پێچەوانە بووەتەوە و ئارەزوو بەهێز بووە لە دڵدا و باوەڕ لاواز بووە، ئەم باسەش لەسەر باوەڕ و پەیوەندی بە رەفتارەوە بۆمان راڤە دەکات! دیاردەی دوور کەوتنەوەی کردار لە گوفتار، کردار لە زانست، هەر کە باوەڕ لاواز بوو ئارەزوو بەهێز دەبێ، چونکە دڵ یەك مەیدانی هەیە ئەمەش کاریگەرییەکی خراپی ترسناك پێکدێنێ ! زیاد دەکا و کەم دەبێتەوە بەگوێرەی پلەی لاوازی باوەڕەکە .

**لە کاریگەرییەکانی لاوازی باوەڕ :**

- دوورکەوتنەوەی کردار لە گوفتار: دەبینی کەسێك زۆر باس دەکات لە بەها باڵاکان و رێ‌ی بەفەرخ و رەوشتی بەرز، بەڵام پێچەوانەی وتەکانی رەفتار دەکات، هەندێ جار دەبینی توشی بێئارامی و پەژارەبووە لە حاڵ و باری خۆی بەڵام ناتوانێ خۆی بگۆڕێ چونکە ئارەزووی زاڵ بووە بەسەر ویستیا و دەستی بەسەرا گرتووە .
- داوای رێدان دەکات لەوەی کە نابێ رێدانی تێدا بێ، ئاسانکاری و تەمەڵی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی شەرعدا، گەڕان بەدوای رێپێدان و بیانوودا، بەکارهێنانی رای لاواز بۆ دۆزینەوەی بیانووی رێپێدراو بۆ خۆدزینەوە لە پەیڕەو کردنی راست لە دینداریدا، گرنگیدانی توند بە دنیا و هۆگربوون لەسەر کۆکردنەوەی ، خەریککردنی بیروهۆش بە دنیاوە و خەو بینینی پە ئاگا بە دەوڵەمەندی و باش رابواردنەوە ، دەبینی زۆر بە دوای نرخی پارەکان و زەوی و، خانوو، ئۆتۆمۆبیل و ... هەروەها دەبینی لە بازنەی حەرامەکان نزیك دەبێتەوە و وەك ئاسانکاری لە درۆکردندا، پەیمان دەشکێنێ، ئیرەیی دەبا، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لا لاواز دەبێت، برایەتیکردنی ئیمانی لا لاواز دەبێ،

چونکە برایەتیکردن هاوملی ئیمانە بە زۆربونی زۆر دەبێت و بە کەمبونی کەم

## ◘ لە ئامانجەکانی پەروەردەی دڵ :

( أ ) ئامانجی نزیک : بێدار بوونی دڵ .

مەبەست بێدارییەکی راستەقینەی هەمیشەییە کە لە دڵدا جێگیر بێت و بە هەموو بوونیا ڕێبکات و ژیانێکی نوێ دەست پێبکات .

(ب) ئامانجی دوور ، بریتین لە :

١. دامەزراوی و دەسەلاتگرتنی باوەڕ بەسەر دڵدا ؛ تاکو ویستی ئازاد ببێ لە بەندێتی ئارەزوو دڵێکی زیندو لەدایک ببێ و بچێ بەپیر رووداوەکانەوە، بەجوانی مامەڵە بکات لەگەڵ نوێگەرییەکانی ژیاندا بە پاڵنەری باوەڕ :﴿... وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ التغابن/١١.

واتە: ... ئەوەی باوەڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی ڕێنموویی دەکات بۆ لای خۆی، خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە.

• لە نیشانەکانی پێکهاتنی :

نەرمی دڵ ، خێرا کاریگەر بوون بە ئامۆژگاری، چاکبونی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا، نزیکبونەوەی لەخوا و وابەستەبوونی دڵی بەوەوە، پەلە کردن بەرەو بەهەشت، هەست بە ئارامی و دڵنیایی و هێمنی ناوەکی دەکات.

ئەوکاتە هەرچی توش دەبێ رافەیەکی مامەڵەیی ئیمانی لەگەڵ دەکات، وەك رسول الله (ﷺ) دەفەرموێت : [ عجبا لأمر المؤمن ، إن

چونکە برایەتیکردن هاوەڵی ئیمانە  بە زۆربونی زۆر دەبێت و بە کەمبونی کەم

## ☒ لە ئاما نجەکانی پەروەردەی دڵ :

( أ ) ئامانجی نزیك : بێدار بوونی دڵ .

مەبەست بێدارییەکی راستەقینەی هەمیشەییە کە لە دڵدا جێگیر بێ و بە هەموو بوونیا رێبکات و ژیانێکی نوێ دەست پێبکات .

(ب) ئامانجی دوور ، بریتین لە :

١. دامەزراوی و دەسەڵاتگرتنی باوەڕ بەسەر دڵدا ؛ تاکو ویستی ئازاد بێ لە بەندێتی ئارەزوو  دڵێکی زیندو لەدایك ببێ و بچێ بەپیر رووداوەکانەوە، بەجوانی مامەڵە بکات لەگەڵ نوێگەرییەکانی ژیاندا بە پاڵنەری باوەڕ :﴿... وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ التغابن/١١.

واتە: ... ئەوەی باوەڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی رێنموویی دەکات بۆ لای خۆی، خوای گەورە بە هەموو شتێك زانایە.

- لە نیشانەکانی پێگەیاندنی :

نەرمی دڵ ، خێرا کاریگەر بوون بە ئامۆژگاری، چاکبونی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا، نزیکبونەوەی لەخوا و وابەستەبوونی دڵی بەوەوە، پەلە کردن بەرەو بەهەشت، هەست بە ئارامی و دڵنیایی و هێمنی ناوەکی دەکات.

ئەوکاتە هەرچی توش دەبێ رازییەکی مامەڵەیی ئیمانی لەگەڵ دەکات، وەك رسول الله (ﷺ) دەفەرموێت : { عجبا لأمر المؤمن ، إن

أمره كله خير ، وليس ذاك لأحد إلا للمؤمن ، إن أصابته سراء شكر ، فكان خيرا له ، وإن أصابته ضراء ، صبر فكان خيرا له } رواه مسلم .

٢. روناكبونەوەی دڵ : تاكو دڵی پاك و خاوێن و سپی بێ، بەرچاوی روناك بێ و پلەی هەستیاری بەرز بێت روو بە هەموو ئەوەی خوا رازیدەكەن و پێشبڕكێ بكات بۆ كردنیان، وە پەلە بكات بۆ واز هێنان لە هەموو ئەوەی خوا پێی ناخۆشە .

٣. هەستەكانی رامكا بۆ خوا ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : { من أحب لله، وأبغض لله ، وأعطى لله ، ومنع لله فقد استكمل الإيمان } ابو داود ریوایەتی كردووە و ئلبانی راستی كردۆتەوە لە (صحيح الجامع/٥٩٦٥) .

د. گەیشتن بە قۆناغی إحسان :

لە فەرموودە بەناوبانگەكەی (جبريل)دا هاتووە: {الإحسان أن تعبد الله كأنك تراه ، فإن لم تكن تراه فإنه يراك} مسلم ریوایەتی كردوه.

لە نیشانەكانی :

ملكەچی هەست و رەفتارەكانی بۆ خوا : { لا يبلغ العبد حقيقة الإيمان حتى يعلم أن ما أصابه لم يكن ليخطئه ، وما أخطئه لم يكن ليصيبه} طبرانی دەریهێناوە لە ( مجمع الزوائد ٩/٥٨)وە احمد (٦/٤٤١ ، ژمارە/٢٧٥٣٠ ) .

دڵ كە ئەم قۆناغەی بڕی ؟ پڕ دەبێ لە ئارامی و ئاسودەیی و دەكەوێتە پەیوەندی یەكی بتەو لەگەڵ پەروەردگاریدا .. سوپاسگوزاری نیعمەتەكانی دەبێ، ئارامگر دەبێ لەسەر بەڵاكان، رازی دەبێ بە قەزاكانی، ئارام دەبێ بە یادكردنی، لە شەوقێكی هەمیشەیی و ئاراستەبونێكی بەردەوام دا دەبێ بەرەو خوا.

هەنگاوەكانی پەروەردە كردنی دڵ :

( أ ) ئەركی خاوەن دڵەكە :

١. خۆئامادە كردن و داواكردنی رێنموویی لەخوا :

باوەڕ یارمەتییەکی بێ خەوشە لە خوای بڵندەوە ، دەیبەخشێ بەو بەندانەی کە دەیانبینێ ئارەزووی دەکەن، وەك لە فەرموودە قودسییەکەدا هاتووە : { یا عبادي کلکم ضال إلا من هدیته ، فاستهدوني أهدکم} أخرجه مسلم٤/١٩٩٤/رقم٢٥٧٧ . بێگومان قایلبوونی ژیری ڕێبازی ئەم ئارەزوویە .. ئەم قایلبوونە دەبێ تێکەڵ ببێ بە لاکردنەوەیەکی دڵی و سۆز، وە چاوەڕوانی ئەو ساتە گونجاوە بکات کە خوای گەورە تیایدا خەڵاتی بکات ، ئەو ساتەی کە دەدرەوشێتەوە و سنگی گوشاد دەبێت بۆ باوەڕ، پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾الأنعام/١٢٥ .

واتە: ئەو کەسەی خێری تێدا بێت و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێ، هەروەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز ببێتەوە، ئا بەو شێوەیە خوا گومڕایی و پیسی هاوڵگەری لەسەر دڵی ئەوان دادەنێت کە باوەڕ ناهێنن.

بۆیە پێویستە مرۆڤی دڵسۆز بەخۆی ، بە گەرمی هەوڵ بدات ، تواناکانی بخاتە گەڕ بۆ ناسینی خۆی ئینجا پەروەردگاری .. وە

دڵنیابین کە بەشی لای خوایە و پێویستە بەجوانی داوای بکات﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾

٢. بەجێهێنانی نوێژەکان بە جۆش و خرۆشەوە و لە کاتی خۆیاندا بە شێوەیەک کاریگەری باشی هەبێ لەسەر رەوشت و مامەڵە و رەفتاری :

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾العنكبوت/٤٥ .

واتە: بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناهو تاوان و نادروستی دەکات.

٣. ستایش کردن و یادکردنی خوا بە بێداری و بەردەوامی تاکو ببێتە راکێشەری نوری خوا و روناککردنەوەی ناو دڵەکان :

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾الرعد/٢٨ .

واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار ، ئاگادار بن دڵەکان هەر بە قورئان و یادی خوا و پابەندبوون بە ئایەتەکەیەوە خۆشنود دەبن و دەحەوێنەوە.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾الأنفال/٢ .

واتە: بێگومان ئیماندارنی راستەقینە تەنها ئەوانەن:

یەکەم : کەکاتێک ناوی خوا برا ، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت .

دووەم: کاتێک ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوەن ئەوە باوەڕیان زیاد دەکات.

سێهەم: لە هەموو کارو بارێکیشیاندا هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن .

٤. سود وەرگرتن لە پارێزە ئەرەکانی رێگا .. وەك (یادکردن و بیرکردنەوە لە مردن، شەو نوێژو نزا و پاڕانەوە لەخوا، تێگەیشتن لە رێڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) و پەیڕەوکردنی .

٥. سود وەرگرتنی باش لە پەروەرشکارەکەی ، بەتێگەیشتن و بەجێهێنانی ئامۆژگاری و ئاراستەکردنی.

(ب) ئەرکی پەروەرشکارەکە :

یەکەم هەنگاو پێویستە پەروەرشکار پێشەنگێکی باش بێت بۆ قوتابییەکەی، وەهەوڵبدات بۆ خاڵیکردنەوەی لە رەوشت و رەفتارە خراپ و ناپەسەندو نا شەرعیەکان، بە تێگەیاندن و ترساندن بە سەرەنجامی لادان و دوچاربون بە سزاو ناڕەحەتی و لە دوارۆژیشدا کەوتنە ناو دۆزەخ، ئینجا بە جوانی کار بکات لەسەر رازاندنەوەی بە رەوشت و رەفتارە جوان و پەسەند و شەرعیەکان، ئەمەش بە رێگای فێرکردن و تێگەیاندن و راهێنان.

## سێیەم : دەروون ( النفس)[1]

دەروون:ئەو هێزەیە کە خوای گەورە لە ناوەوەی مرۆڤ پێکیهێناوە تاکو بەهۆزیەوە تاقیمان بکاتەوە:

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ الشمس/٧-١٠ ...

[1] سەیری کتێبی (فقه الدعوة ج١ ل٦١٣ .. الأركان الداخلية للنفس الانسانية) ... بکە.

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ الانبياء/٣٥ ...

﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ النازعات/٤١.

جا ئەو کەسەی ئەو هێزە بە پاك رابگرێت ئەوا سەربەرز دەبێت‌و لە تاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو دەبێت، وە بە پێچەوانەوە ئەوەی ئەو هێزە بەرەڵا بکات ئەوا لە تاقیکردنەوە شکست دێنێت‌و زەرەرمەند دەبێت .

بەڵێ ! دەروون کۆرگەری ئارەزووەکانە لە ناوەوەی مرۆڤدا، بۆیە لە سروشتیدا هەمیشە خوازیاری بەدیهێنانی حەز و ئارەزووەکانیەتی، دەیەوێ بەشی هەبێ لە هەموو کارێکدا کە مرۆڤ ئەنجامی دەدا بەبێ سەیرکردنی سەرەنجامەکانی، وەکو منداڵێك کە هەڵدەستێ بە تەنگ پێ‌هەڵچنین‌و زۆرکردن لە باوك‌و دایکی بۆ وەدەست هێنانی شتێك کە لەوانەیە زیانی ئەوی تێدا بێت .

دەروون فەرمان بە خراپە ناکات لەبەر ریستنی خراپە لە خۆیدا ، بەڵام بەو گومانەی ئارەزوویەکی لێدەستکەوێ .

دەروون : مەیدانی پێشپاردنە ، چروگە، ئەوەی زۆر ئاسودەی دەکات هەست کردنیەتی بەوەی بایەخدارترە لە کەسانی تر، وە ئەوەی زۆر ئازاری دەدا و توشی پەژارەی دەکات هەست کردنە بەوەی لەوان کەمترە.

بەشەکانی ئارەزووی دەروون :

دەروون هەمیشە حەز و مەیلی وا بەلای بەدیهێنانی ئارەزووەکانەوە، ئەمانیش دەبن بە دوو بەشەوە :

١. ئارەزووی دیار : بریتین لە چێژی خواردن و خواردنەوە ... هتد .

ئارەزووی شاراوە : بریتین لە چێژی بەرهەمی پیاهەڵدان و ستایشی خەڵکی ، هەروەها هەستکردن بە بەرزێتی و جیایی لە کەسانی تر ، پلەی بەرزی بە سەریاندا ، پێشکەوتنیان ، لەخۆڕازیبوون ... .

ئارەزووە دیارەکان شەرع رێکیخستون و دیاریکردون لە روی حەڵاڵ و حەرام و رێپێدراو و نەویستراوەکان، بۆیە ئاسانە بۆ کەسانی خاوەن باوەڕی زیندو کە پابەند بین بەم رێکخەرانەوە .

بەڵام ئارەزووە نادیارەکان لەگەڵ ئاگادارکردنەوەی توندی شەرع لە دابەزین لەگەڵیا ، بەڵام زۆرێك سڵ ناکەنەوە لەم ئاگادارکردنەوە و مامەڵەی لەگەڵدا ناکەن وەك مامەڵە کردنیان بە وریاریی و رێکو پێکییەوە لەگەڵ ئارەزووە دیارەکان، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئارەزووە نادیارەکان بەلەزەتترو خۆشترن بۆ دەروون لە ئارەزووە دیارەکان .

وە لە گرنگترین ئارەزووە نادیارەکان کە دەروون بەنج دەکات و دەیخاتە یارێك لە ئاسودەیی و مەستی و هەستکردنت بە رازیبوون لەخۆ و ، جیابون لە خەڵکی وبەرزی پلەی لەلایان، ئەگەر ویستت ئەندێشەی ئەم هەستانە لێبدەیت پێویستە ئەو جارەت یاد بکەیتەوە کاتێك روبەڕووی پیاهەڵدان دەبیتەوە ... وە لە وێنەی ئارەزووی نادیار کە دەروون هۆگری دەبێ: پلە بەرزی لای خەڵکی لە میانەی چاکردن و جوانکردنی کار لەبەردەمیانا، وە باسکردنی کارە باشە نادیارەکان بۆیان .. لەمەش مەترسیتر بەدڵاچونی کارەکانی یان تواناکان و مەزنبونیان لەلای، وە حەزکردن بە سوپاسکردن لەسەر کارێ کە نەیکردووە ( بەدرۆ دەیخاتە پێش چاو یان بەرامبەرەکەی بۆ پیاهەڵدان بەدرۆ ئەیخاتە روو ... )

﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾

آل عمران/١٨٨ .

واتە: وا گومان مەبە بەوانەی دڵخۆشن بەوەی کە هەیانە و حەز دەکەن باس بکرێن وە خەڵکی سوپاسیان بکات لەسەر کار و چاکەیەک کە نەیانکردووە، ئەوە هەرگیز وا مەزانە ئەوان لە دەست سزا رزگاریان دەبێت ، بەڵکو سزایەکی بەئێش چاوەڕێیانە .

ئەمەش ئەگەر کەسەکە بەدەمیەوە چوو خۆی دا بەدەستەوە ، ئەوە دوچار دەبێت بە نەخۆشی لەخۆبایی بوون و خۆخەڵەتاندن و فیزکردن و خۆبەزل نواندن بەسەر خەڵکیدا و نەویستنی گوێڕایەڵی بۆ راستی، داننەنان بە هەڵەدا، بۆ ئەمەش ئەم بەڵگە بەسە کە ئیبلیس فەرمانەکەی خوای بەجێنەهێنا کە سوجدەی رێزبردن بوو بۆ ئادەم بەهۆی خۆبەزلزانینەوە :﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ۖ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾الاعراف/١٢.

☒ لە ئامانجەکانی پەروەردەی دەروون :

١. پەروەردەکردن لە سەر بەندایەتیکردنی راستەقینە بۆ خوای بەرز و بڵند.

٢. تێگەیشتنی بەندە لەوەی کە لە نێوان ئەو و بێباوەڕیدا ئەوەیە کە خوا وازی لێ بێنێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ

﴿وَٱلْمُنكَرِۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾النور/٢١ .

٣. بەندە تێبگات و دڵنیا بێ کە ملکەچکردنی بۆ خوا ، خوا یارمەتیداوە و وابڵێکردووە حەز لە بەجێهێنانیان بکات‌و هێز و تواناى پێویستی پێداوە بۆ بەجێهێنان‌و ڕێگرەکانی بەردەم بەجێهێنانی بۆ ڕامالیوە ﴿وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾سبأ/٥٠ .

٤. بەدیهێنانی خاکیبوون و مومارەسەکردن بە شێوەیەکی خۆڕەسی‌و بەبێ زۆر لە خۆکردن .

٥. مرۆڤ وا تێبگات لە دەروونیا بچوکبێ و خەڵکی بەباشتر لەخۆی سەیر بکات.

▣ لە هەنگاوەکانی پەروەردەکردنی دەروون :

١. ڕاهێنانی دەروون لەسەر ڕەوشتە جوانەکان:

یەکەم هەنگاو بۆ پاکژکردنی دەروون‌و بەدەستهێنانی سەرکەوتن ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾ پێویستە ڕابهێنرێ لەسەر خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتە جوانەکان‌و خۆدارنین لە ڕەوشتە ناشیرین‌و ناپەسەندەکان .. بۆ نمونە :

* ڕەوشتی بەخشندەیی بەوە دەبێت کە بەردەوام ببەخشێت تا ڕادێت لەسەر بەخشین و بەخشین ئاسان دەبێت لەلات و دەبیتە بەخشندە.
* ڕەوشتی خاکی بوون: بەوە دەبێ کە دەروونت ڕابێنی لەسەر خاکیتی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ تا زاڵ دەبێت بەسەر خۆ بەزلزانیندا و خاکی بوون ئاسان دەبێت بۆت و دەبیتە کەسێکی خاکی.

- هەروەها هەموو شتە جوان و شەرعیەکان بەدەست دێت بەم ڕێگا، وە دەتوانیت هاوکاری و سودی باش وەرگریت لە پەروەرشکار و ڕاهێنەرانی ئەم بوارە .

٢. مەرجدانان بۆ مامەڵەی دەروون:

هەر وەک بازرگان مەرج دادەنێ بۆ هاوبەشەکەی و ماڵەکەی دەداتە دەستی تا بازرگانی پێوە بکات، دوایی حسابی لەگەڵ دەکات و لێی دەپرسێتەوە لە پێناو پاراستنی ماڵەکەی و قازانجەکەیدا، ئاوەهاش ژیری بازرگانی ڕێگەی قیامەتە و مەبەست و قازانجەکەشی پاکژکردنەوەی دەروونە وەک پەروەردگار دەفەرموێ ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾ وە سەرکەوتن و قازانجی لە ئەنجامدانی ڕەفتارە جوانەکان و کردارە باشەکانیدایە ، بۆیە پێویستە ژیریش لەم بازرگانیەدا مەرج دانێ بۆ دەروون کە ڕەوشتە جوان و بەرزەکان و ڕەفتارە باشەکان ئەنجام بدات کە ئەمەیە قازانجی ، وە دوورە پەرێز بێت لە ڕەوشت و ڕەفتارە خراپ و ناشیرینەکان کە ئەنجامدانیان زیانکردنە لەم بازرگانیەدا، وە ئەرک و مەرجەکانیش بە گوێرەی لێهاتن دابەشکا بەسەر حەوت ئەندامەکەی لەشدا کە بریتین لە چاو و گوێ و زمان و ورگ و داوێن و دەست و قاچ .

٣. چاودێری : دوای ئامۆژگاری کردنی دەروون و دانانی مەرج بەسەریەوە و چوونە ناو مامەڵە و کارکردنەوە پێویست بە چاودێریکردن دەکات بە چاوێکی ئیشککر، چونکە ئەگەر چاودێری نەکرا یاخی دەبێ و توشی گەندەڵی دەبێت، وە چاودێرییەکی سەرکەوتوانەی دەروون بەوە دەبێت پلەی باوەڕ و خواناسی بگەیەنێتە پلەی (احسان) ئەم پلەش ئەوەیە کە دڵنیا بێت هەمیشە لە ژێر چاودێری خودادایت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ وە پێناسەی (احسان) لە فەرموودە بەناوبانگەکەی جبریلدا هاتووە: { أن تعبدَ الله كأنك تراه } متفق عليه .

٤. پرسینەوە لە دەروون دوای ئەنجامدانی کار : هەروەك پێویستە بەندەی خواناس لە سەرەتای رۆژەوە مەرجەکان بخاتەوە بیری دەروونی وئامۆژگاری بکات لەسەر رەوا و راستی ، ئاوەهاش لە کۆتایی رۆژدا کاتێك تەرخانکا بۆ لێپرسینەوەی لەسەر هەڵس و کەوت و مامەڵە و رەفتارەکانی

٥. سزادانی دەروون لەسەر کەمتەرخەمی و تاوانەکانی :

دوای لێپرسینەوە ئەگەر کەمتەرخەمیەك یا گوناهێکی لێدەرکەوت نابێ پشتگوێی بخات، چونکە ئەگەر پشتگوێی خست کەمتەرخەمی و گوناهکردنی لا ئاسان دەبێ و رادێت لەگەڵیا و وازلێهێنانی لا گران دەبێ ، بۆیە دەبێ سزایەکی گونجاوی دەروونی بدات لەسەر کەمتەرخەمی و تاوانەکانی ، بۆ نمونە :ئەگەر تیکەیەکی گومانلێکراوی بە ئارەزوو خواردبوو سزای سکی بدات بە برسیکردن،

هەروەها سزای هەر ئەندامێکی لادەری بدات بە قەدەغەکردنی لە ئارەزووەکانی؛ بەسزایەکی گونجاو و شەرعی .

**چوارەم : بزوتن .**

لە سروشتی هەموو مرۆڤێکدایە کە ببزوێ و رەنجبدات لە پێناو بەدەمەوەچونی پێویستییەکانی و هێنانە دی ئاوات‌و ئامانجەکانی، کەواتە: بزوتن نیشانەی ژیانە . ئەم بزوتنەش دەبێ ئاراستەیەکی راست‌و دروست بکرێت تاکو بەردار بێت‌و ببێتە هۆی سەرکەوتن لە هێنانە دی ئامانجی بوونی مرۆڤ لەسەر زەویدا.

وە لەگەڵ پێویستی گرنگیدان بە پەروەردەی زانستی‌و باوەڕی و دەروونی، گرنگی پەروەردەکردنی بزوتنیش دێت، ئەگەر موسڵمان نەبزوا و هەوڵی نەدا ئەوەی وەریگرتووە بی گەیەنێ‌و دەستی خەڵکیش بگرێ بۆ گۆڕانکاری و راست بونەوە، ئەوکاتە خۆی توشی ساردبونەوە و خاوبونەوە و تەمەڵی دەبێت‌و ئیتر لە مانا و مەبەستی زۆرێک لەوەی فێریبووە تێ‌ناگات.

کەواتە ئەم لاشەو بوونە پێویستە پەروەردە بکرێت لە دوو رووەوە :

1. پاراستنی لاشە وپێدانی خۆراکی دروست و وەرزشکردنی پێویست کە لای کەمەکەی ئەو جموجوڵەیە کە لە ئەنجامدانی نوێژدا دەکرێت .
2. هەستان بە ئەنجامدانی ئەو ئەرکە خواییەی کە خراوەتە ئەستۆی ا کە بریتی یە لە بەندایەتیکردنێکی راست‌و دروست ئەمەش بە خۆشەحنکردن، بە نوری خوا بە رێگای پەرستشە تایبەتیەکان‌و ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی و خۆشکردنی ژیان تیایدا...

☒ ئامانجی پەروەردەی بزوتن .

پەروەردەی بزوتن دەبێت رێکخستن‌و ئاراستەکردنی بزوتنی موسڵمان لە ژیاندا بگرێتەوە تاکو ئەم ئامانجانەش بێنە دی :

1. کاریگەریەکی باشی هەبێ لەو جێگای کە تیایدا دەژی :

﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ﴾مريم/٣١.

٢. بەشدارییەكی باش بكات لە ئەنجامدانی پرۆژەی ئیسلامی كە ئامانجی دەستپێكردنەوەی ژیانی ئیسلامەتی راستەقینەیە.

٣. رزگار كردنی مرۆڤ لە تیاچوون، وەناسوەدەكردنی بە ئیسلام : ﴿وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾الأنفال/٣٩.

لەبەر ئەوەی ئەم بەشە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە خاڵی دووەم و سێیەمەوە لێرەدا زیاتر لەسەری ناڕۆین .

## هەنگاوی دووەم :خستنە گەڕی تواناكان لە چاكەكردندا :

( وعملوا الصالحات) كاركردن (العمل) لە (١٥١) ئایەت و (٧٤) فەرموودەدا هاتووە.

العمل ؛ واتە: پیشە و كار .

العمل الصالح : ئەو كارەیە كە رێكوپێكو تەواو بێت، وە پێویستە دوو مەرجی تێدا بێت :

یەكەم : پوخت بۆ خوا بێت ..

دووەم: بەگوێرەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت .

خوای گەورە بەگوێرەی پێویست وزە و توانای بە مرۆڤ بەخشیوە، سروشتێكی پێداوە كە بجوڵێو رەنجبدات لە پێناو پەیداكردنی پێویستیەكانی و بەدیهێنانی ئامانجەكانی، جوڵەش نیشانەی ژیانە .

پێویستە توانای بزوتن ئاراستەیەكی راستو دروست بكرێت تاكو بەردار بێت و سەركەوتن بەدەستبێنێ لە هێنانەدی ئامانجی بووندا.

بەڵێ پێویستە موسڵمان تواناكانی بخاتە گەڕ لە :

یەکەم : لە خزمەتکردنی خۆیدا؛ لە تەواوکردنی پەروەردەکردنیدا لە هەموو رووەکانەوە و پەیداکردنی پێویستیەکانی بەبێ زیادەڕەوی و کەم ڕەوی، وەک پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ:{فإن لجسدك عليك حقا ، وإن لعينك عليك حقا ، وإن لزورك عليك حقا ، وإن لزوجك عليك حقا}رواه البخاري .

بۆ بەدەست هێنانی سودی باش؛ شارەزابوون و ڕاهێنانی دەوێت؛ واتە(گەشەدان بە خود) .

دووەم : لە ئەنجامدانی چاکەکان : پەرستشە فەرمانپێکراوەکان وئەنجامدانی کارە چاکەکان کە تەبابن لەگەڵ قورئان و سوننەتدا ، بەمەش باوەڕ جێگیرتر و بتەوتر دەبێت.

لەم بارەیەوە ئیمامی غەزالی دەفەرموێ :

" کارکردن کار دەکاتە سەر گەشەکردنی باوەڕ و زیادکردنی ، هەروەک ئاودان کار دەکاتە سەر گەشەکردنی درەخت "[1]

بۆ ئەوەی سود وەرگرێ لە کردەوەی چاک؛ دەبێ لە پێشا هەستەکان بەهەژێنەرێن تاکو پەیوەندی روبدات لە نێوان هەستەکان و ئەندامانی لەشدا، دوای ئەمە کارەکە دێتە بەر وباوەڕ زیاد دەکا؛ وە تا ئەم پەیوەستیەش بەهێزتر بێت کاریگەری توندتر و بەهێزتر دەبێت، بۆ ئەمەش گەورەترین نمونە ( نوێژە) وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :

{ إن الرجل لينصرف وما كتب له إلا عُشر صلاته، تسعها، ثمنها، سبعها، سدسها، خمسها، ربعها، ثلثها، نصفها}[2].

---

[1] احياء علوم الدين ج١ ص١٢٠ .

هەروەها دەفەرموێ : { اذكر الموت في صلاتك فإن الرجل اذا ذكر الموت في صلاته لحريٌ أن يحسن صلاته }[1] .

هەژاندنی هەستەکان یادخستنەوە و هاندانی دەوێ ، وە بەگوێرەی پلەی بارەرو گرانی کارەکە قەبارەی یادخستنەوە و هاندان دەگۆڕێت. بۆ نمونە جەنگ لەو کارانەیە کە لەسەر دەروون گرانە ، بۆیە ئاراستەی قورئان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) :

﴿ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ﴾[2] .

واتای (حرِّض) : زۆر بیانوروژێنە و هانیان بدە.

وە ئامانجی هاندان و یادخستنەوە ؛ وروژاندن و جۆشدانی هەستەکانە ... هەستی ( حەز یا تەماع، ترس، پیاوەتی ... هتد) وە چەمکی هاندان و یادخستنەوە پێش کارکردن تا ئاستێکی بەرز هاوبەشی دەکەن لەگەڵ چەمکی نیەتهێنان پێش کارکردن.

نیەت : واتە: مەبەست و جوڵان و ئاراستە بوون، وە تا ئاراستە بوون و روکردنە خوا لەکارکردندا بەرزترو قوڵتر بێت کارەکە سودی زیاتر دەبێت.

هۆکارگەلێکی زۆر هەن بۆ هاندان و بیرخستنەوە کە دەتوانین بەکاریان بهێنین پێش دەستپێکردنی کار و بە گوێرەی گونجانی لەگەڵ کار و مەبەست و کاتی هەبوو ؛ بۆ نمونە: ئەو کەسەی لە سەر رێگا لەبەر دەمیدا بەردێ دەبینێ ؛ پێویستی دەبێ بە هاندانێکی خێرا بە هۆکارێك یا دوو هۆکار پێش ئەوەی بەردەکە لاببات، لەو هۆکارانەش :

١. پرسیار : بەڵێ پرسیارکردن :

---

[1] حديث حسن اخرجه ابوداود .

[2] الأنفال/٦٥ .

(أ) هەستی حەزکردن بۆ زانینی وەڵام لە ناخی مرۆڤدا دەجوڵێنێ.

(ب) پەردەخاتە کەڕ بۆ گەڕان بەدوای وەڵامدا.

(ج) هۆکارێکی گرنگە بۆ هۆشیارکردنەوەی ژیری .

قورئان پڕە لە ئاراستەکردن و واتا ئیمانیەکان بە پرسیارکردن، وەك :

﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا﴾[1]

هەروەها سوننەتیش پڕە : وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ :
{أتدرونَ مَن المُفلس}[2]

{ ألا أخبركم ، بأفضل من درجة الصيام ، والقيام ؟ " ، قالوا : بلى يا رسول الله ، قال : " إصلاح ذات البين ، وفساد ذات البين هي الحالقة}[3]

بۆ هاندان پێش کارکردن چاك وایە بپرسین لە خۆ-ان ،وەك:

( ا ) بۆچ ئەم کارە بکەم ؟

(ب) بۆچ دەستنوێژ بگرم ؟

(ج) بۆچ بەکۆمەڵ لە مزگەوت نوێژ بکەم ؟

٢. یادکردنی خوا لە کردنی ئەو کارەدا : یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکان، بیرکردنەوە لەوەی کە خوای پاك و بلند پێی خۆشە بەندەکەی ئەم کارە چاکەدا ببینێ ، وە شانازی پێوە دەکات لای فریشتەکان، وە چاکەکردن دەبێتە هۆی وەدیهێنانی ڕەزامەندی خوا و نزیکبونەوە

---

[1] الكهف/١٠٣ .

[2] اخرجه مسلم .

[3] حديث صحيح اخرجه ابو داود.

لێی، وه یادکردنەوەی ئەم مانایانە هەستی ئامەزرێیی خولیابوون بۆ خوا دەهەژێنێ .

لەو ئایەت و فەرمودانەش کە دڵنیامان دەکەن لەم مانایە :﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾البقرة/٢٢٢.

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: { إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملا أن يتقنه }[1]

٣. یادخستنەوە بە چاکی و گرنگی کارکردن: دەروونی مرۆڤ حەز دەکات لە وەدەستهێنانی هەر سودێك کەوتە پێش چاوی و وەرگرتنی کرێ لەسەر هەر کارێك کە ئەنجامی دەدات، وە هەستی حەزکردن لە دڵیدا دەوروژێنێ هەر کە تێگەیشت لە گرنگی ئەو کارەی کە نیازی هەیە بیکات. کەواتە یادخستنەوەی سودو گرنگی کارەکە هاندەرێکی سوك و باشە بۆ کردنی کارەکە، قورئان و سوننەت زۆرێك لەم نمونانەی تێدایە ، وەك : ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ﴾ البقرة/٢٦١ .

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: { عليكم بقيام الليل ؛ فإنه دأب الصالحين قبلكم، وإن قيام الليل قربة إلى الله تعالى ، وتكفير للسيئات ، ومنهاة عن الإثم ومطردة للداء عن الجسد }[2]

---

[1] حديث حسن أخرجه البيهقي .

[2] حديث صحيح أخرجه الترمذي .

٤. ترسان له ئەنجامی خراپی کارنەکردن:
له سروشتی مرۆڤە ئەگەر ترسێنرا دەترسێت، ئەگەر سەرکەوتو بووین له یادخستنەوەی خۆمان له مەترسی واز هێنان له ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان، یا ساردوسڕی له بەجێهێنانیاندا و بەمەش چەند زیانی ئەم دنیا و قیامەتیشمان لێ دەکەوێت بێگومان ئەم یادخستنەوەیە پاڵمان دەنێت بۆ ئەنجامدانی . ئایەت و فەرمووده لەم بارەوە :

﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾ محمد/٣٨.

واتە: ئا ئەوەتە ئێوە بانگ دەكرێن تا بەخشینتان هەبێت لە پێناو خوادا ، کەچی هەتانە رەزیل و بەرچاو تەنگە ، خۆ ئەوەی رەزیل و بەرچاوتەنگی هەبێت، ئەوە بێگومان هەر رەزیلی لە خۆی دەکات و زەرەر لەخۆی دەدات ، چونکە هەر خوا خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازە ، هەر ئێوەن هەژار و نەدار و کەم دەست و بەنیاز ، جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم دین و بەرنامەیە ، خوا کەسانی چاکتر لە ئێوە دەهێنێتە مەیدان، کە بە هیچ شێوەیەك لە ئێوە ناچن و وەك ئێوە نابن .

پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: { أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته قالوا : كيف يسرق من صلاته ؟ قال : لا يتم ركوعها ولا سجودها ولا خشوعها}[١]

٥. یادخستنەوە لە هەڵوێستە چاکە پێشووەکان:
ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ورە دەوروژێنن و پاڵدەنێت بۆ هەستان بەکارکردن، کاتێ هەستت کرد بە ساردو سڕی و تەمەڵی بۆ هەستان بۆ شەو نوێژ، یادی خۆت بخەرەوە لەو شەوەی کە نیوەشەو هەستایت بۆ شەونوێژ کە چەند ئاسان و خۆش بوو .. وە کاتێ هەستت کرد کە بێکەڵکە هەستی بە کردنی کارێك لە ئەنجامی ئاسکی کات و کەم توانایی لەسەرتە یادی خۆت بخەیتەوە لە هەڵوێستی باش کە پێشتر توشت هات و بارودۆخەکە سەختتربوو لەگەڵ ئەمەشا خوای گەورە خەڵاتی کردی بە گونجان و ئەنجامدان و سەرکەوتن.

سەرنجی ئایەتەکانی (٦٢-٦٣)سورەتی الانفال بدە: ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٢ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٣﴾ .. کە تیایاندا یادی پێغەمبەر(ﷺ) خراوەتەوە بە هەڵوێستە پێشووەکان کە دەسەڵات و پشتیوانی خوای تیا دەرکەوت تاکو دوای ئەم یادخستنەوە ئەم ئاراستانە بکرێت بەم ئایەتانە (٦٤-٦٥/ الانفال):﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ

عَلَى ٱلْقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾

٦ـ وتو ویژو قایلکردن و هەڵسەنگاندنی زیریانە :

کاتێ مرۆڤ قایلدەبێ بە گرنگی و نرخی ئەو کارەی داوای بەجێهێنانی لێکراوە، وە چەند سودمەند دەبێت ، ئەمە هانی دەدات بۆ بەجێهێنانی بە هەستی حەز و پێویستی ، وە هەروەها کاتێ قایلدەبێ بە مەترسی و زیانی ئەو ئیشەی کە دەیەوێ بیکات، ئەو کاتە بە ویستی خۆی واز لە کردنی دەهێنێ، ئالێرەوە گرنگی وتو ویژو قایلبون دەردەکەوێ، ئیتر لە نێوان مرۆڤ و خودیا بێت یا لە نێوان خۆی و کەسانی تردا بێت، وە چاک وایە وتو ویژ لەم بارەوە هەڵقوڵاوی ئەو یاسایە بێت کە ناوەرۆکەکەی : ( چاکێتیت بەرژەوەندیتە) (سودمەندی یەکەم لە کاری چاک بکەرەکەیەتی)

بەڵێ دەروونی مرۆڤ حەز ناکات لە دەستچونی کارێك کە سودی پێبگەیەنێ، یا کەوتنە ناو زیانێك کە ئازاری بدا، بۆیە دەبینین قورئان ئەم ڕێگایەش بەکار دەهێنێت بۆ قایلکردن، بۆ نمونە : ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَاۚ﴾ الاسراء/٧ .

واتە: ئەگەر چاکە بکەن، ئەوە هەر بۆخۆتان چاکەو بەسودە، ئەگەر خراپە و تاوانیش بکەن ئەوە هەر بەخەی خۆتان دەگرێتەوە .

﴿قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴾الانعام/١٠٤ .

واته : بێگومان چەندەها بەڵگەی روناکبیرتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە ، جا ئەوەی خۆی روناکبیر بکات و لە راستیەکان تێبگات، تێبگات و گۆڕانکاری لە بیرو هۆش و ژیانیدا ئەنجام بدات ، ئەوە هەر خۆی قازانج دەکات ، ئەو کەسەی چاو دەنوقێنێ لە ئاستی روناکبیریە خواییەکاندا و لەراستی لادەدات ، ئەویش هەر لەسەر خۆی دەکەوێت و خۆی زەرەر دەکات و من ( واتە پێغەمبەر (ﷺ) ) بەهیچ شێوەیەک چاودێرنیم بەسەرتانەوە .

﴿ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾

فصلت/٤٠ .

وە سەرنج بدە ئەو وتو وێژەی نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو گەنجەی کە هاتە لای و داوای ڕێگاپێدانی زیناکردنی لێکرد. کاتێ پێویستی چاک وایە ئەم ڕێگایەش بگرینە بەر بۆ هاندانی خۆمان و خەڵکیش ! بۆ نمونە: کاتێ بانگی بەیانی دەبیسین و هەست دەکەین بە ساردی و سڕی و تەمەڵی ، با وتو وێژ لەگەڵ دەروونی خۆمان بکەین بەم وتانە : .. خەو و حەوانەوە خۆشە .. بەڵام گەر نوێژەکەت لە دەستچوو کێ زیاندەکات؟ کێ پیت و بەرەکەتی ئەو ڕۆژەی لەدەست دەچێ ؟ کێ ئەمڕۆ پەنا و پاراستنی خوای لەکیس دەچێ ؟

٧. هاندان لە میانەی خستنە ڕوی پێشەنگێک :

سروشتی دەروونی مرۆڤ وایە کە حەز ناکات کەس پێشی کەوێت، بۆیە لەسەرمانە کە هەستی پیاوەتی و پەرۆشی و ئازایەتی بورووژێنین،

وە ناراستەیەکی راستی بکەین بەرەو هەڵسان بۆ بەجێهێنانی کرداری داواکراو لە میانەی یادخستنەوە بە کەسانێك کە هەستاون بە ئەنجامدانی ئەو کارە بە باشترین شێوە، قورئان پڕە لەو ئایەتانەی کە موسڵمان هاندەدات بۆ هەڵسان بە کرداری چاك ئەمەش لە میانەی نمونەی مرۆڤی کە هەڵساوە بە کردنی بە باشترین شێوە، وەك :

﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ۝ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝﴾النحل/١٢٠-١٢١ .

پێشڕەو کاریگەری بەهێزە ، وەکو وتراوە : {( کاری پیاوێك لەسەر هەزار پیاو باشترە لە وتەی هەزار پیاو بۆ پیاوێك) (ئەگەر دەتەوێ پێشەوام بی پێشم کەوە) (پێشەنگی پێشەواییە بەبێ مەرەشینی )}

٨. چیرۆك :

چیرۆك رۆڵێکی دیار و بەرزی هەیە لە بزواندنی هەستەکان و دەرخستنی سۆز و جێگیر کردنی بیر لە ژیریدا، چیرۆك پێویستی نیە بە هەوڵدانێکی زۆر بۆ گواستنەوەی بیرۆکەکانی بۆ دەروون .. چونکە لە باری دەروونی مرۆڤە ئەگەر رووداوێکی دی کاریگەر دەبێ لەگەڵیا هەروەها چیرۆك کاریگەری هەیە لەسەر بیسەران یا بینەران کە لەو کاتەدا لە ئەزمونێکی دەروونیدا دەژین ، وە رێگایەکی مرۆڤیان بڕیوە بە گوێرەی درێژی چیرۆکەکە، وە کاریگەرییەکی ویژدانی و گیانی بەجێدەهێڵێ لە دەروونەدا، وە ئامادە دەبێت زیاتر و زیاتر بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کەچیرۆکەکە دەیگەیەنێ.

٩. نمونه هێنانەوە: ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە هاندانی مرۆڤ بۆ هەستان بەکارێك لە میانەی نزیکخستنەوەی واتاکەی‌و کاریگەری لەسەر هەستەکان وە لە سونەکانی :

(ا) دەرخستنی وێنەیەکی واتایی لە وێنەیەکی هەستیدا کە ژیری وەریدەگری .

(ب)ژیری خەڵکی دەدوێنێ بەوەی دەیناسن ، وا دەکات نادیار دەخاتەبەر دەمیان ودورییان بۆ نزیك دەخاتەوە.

مامۆستا نورسی لەم بارەوە دەفەرموێ:

- بە دووربینی (ضرب الأمثال) دوورترین حەقیقەت لە پێش، چاو یەکجار نزیك دەخرێتەوە .
- بەهۆی یەکێتی بابەتیش لە (ضرب الأمثال)دا زۆربەی مەسەلە پەرش‌و بڵاوەکان کۆدەکرێنەوە.
- بە پلیکانەی (ضرب الأمثال)دا زۆر بە ئاسانی سەرکەوتن بۆ بەرزترین حەقیقەت بەدەس دێت[١] .

قورئان و سوننەت زۆرێك لە نمونە هێنانەوەیان تێدایە وەك :

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾﴾الزمر/٢٩ .

---

[١] مەکتوبات لاپەرە/٦٣٨ .

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الحشر/٢١.

لەم بارەوە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ : {مثل المؤمنين في تراحمهم وتوادهم ، وتواصلهم كمثل الجسد ، إذا اشتكى عضو منه تداعى له سائر الجسد ، بالحمى والسهر}[١] .

١٠ . وێنەی کاریگەر :

ئەوەی چاو دەیبینێ واتاکەی بە خێرایی دەگاتە ژێری و دڵ ، وە کاریگەری زیاتر دەبێ لەسەر هەستەکان لەوەی پێیدەگات لە ڕێگەی بیستنەوە .. گەر سەرنجی باری موسی پێغەمبەر (علیه السلام) بدەین کاتێ خوای گەورە ئاگاداری کرد لەوەی کە گەلەکەی کردیان لە بەندایەتیکردن بۆ گوێرەکەکە ! کاریگەر بوو، ڕقی هەڵسا بەڵام ئەو لەوحانەی بەدەستیەوە بوو فڕێی نەدان ، بەڵام کاتێ چوو بۆلای گەلەکەی و بەچاوی خۆی گوێرکە پەرستیەکەی لێبینین زۆر زیاتر ڕقی هەڵساو لەوحەکانی فڕێدا، لەم واتاوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : {ليس الخبر كالمعاينة انّ الله أخبر موسى بما صنع قومه في العجل فلم يلق الألواح فلما عاين ماصنعوا ألقى الألواح فانكسرت}[٢] .

---

١ متفق عليه ، أخرجه البخاري .

٢ أخرجه أحمد .

بەڵێ لە هۆکارە مەزنەکان بۆ هاندان؛ بەکارهێنانی وێنەی زیندووەوە پیشاندانی کاریگەرە کە دەنوسێ بە زێرییەوە و هەستەکان دەبزوێنێ بەرەو ئەوەی وێنە کە دەیگەیەنێ ، نمونە :

- {لە جابیر(ﷺ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە بازاڕدا دەڕۆیشت و خەڵکی بەملا و لایەوە بون، ڕۆیشتن بەلای کارژۆڵەیەکی گوێ بچوکی مرداروبودا، گوێیەکی کارژۆڵەکەی گرت و فەرموی : کامتان ئەمەی دەوێ بە درهەمێك؟ ، وتیان بە هیچ نامانەوێ ، چی لێ بکەین ؟ ئەی دەتانەوێ ئەمە بۆ ئێوە بێ ؟ وتیان : وەڵلا ئەگەر زیندوش بوایە عەیبداربوو، ئەمە "اسك"ە و ئێستا مردارەوە بو ئە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : سوێند بە خوا دنیا لای خوا سوکترە لەمەی لەلای ئێوە }[1]

خوێنەری بەڕێز بیهێنە ئەندێشەت لەگەڵ من! ئەم دیمەنە چەندە کاریگەرە [illegible] ەسەر ئامادەبووانەوە پەیوەندییان بە دنیاوە چۆنی لێهاتووە دوای ئەمە؟!

- بانگخوازێك وتەوەی موحازەرەیەکی پێ سپێررا لە بارەی برایەتی و خۆشەویستی لەبەر خوا و گرنگی زۆری بۆ بانگخوازان .. ئەم بانگخوازە بیری کردەوە و داوای پشتیوانی لە خوا دەکرد تاکو ڕێنموویی کرد بۆشێوازێکی نوێ؛

دوای سوپاس و ستایشی خوا و ناردنی درورد بۆ سەر گیانی پێغەمبەر (ﷺ) :

---

[1] أخرجه مسلم .

تەسبیحێکی درێژی لە گیرفانی دەرهێنا ، داوای ئاوەکەی کرد لە ئامادەبووان، وەڵامیان دایەوە، بەردەوام لەبەر چاویان بەلای راست و چەپدا هەڵیدەسوڕان داوایلێکردن بە چڕی سەرنجی بدەنێ.

بۆ چەند ساتێك بەبێ دەنگی مایەوە ، لە پاشا مقەستێکی لە گیرفانی دەرهێنا، لە ئاوەڕاستیدا بە مقەستەکە پەتی هۆندنەوەکەی قرتاند، دانەکانی تەسبیحەکە لە پەتەکە دەرچوون و بە هۆڵەکەو زۆربەی ئامادەبواندا بڵاو بونەوە، هەموو ئامادەبوان دۆشداماں لەم دیمەنە کاریگەرە.

لەم ساتەدا بانگخوازەکە بێدەنگیەکەی بڕی و وتی بەداتیشتوان: بە دڵنیاییەوە دەمەوانەی ئاسودە بۆ ئەم بانگەوازە پاش هێزی پەیوەندی بە خواوە ! بریتی یە لە پەیوەندی برایەتی، برایەتی ئەو بەستەرەیە کە دڵانی رۆڵەکانی بانگەواز رێکدەخات ، هەندێکیان پەیوەست دەکات بە هەندێکی تریانەوە، ئەگەر ئەو بەستەرە خاو بوە یا پچڕا ئیتر دڵەکان پرژو بڵاو دەبنەوە و لەیەك دور دەکەونەوە، ئەمەش خراپترین کاریگەری دەبێ لەسەر بانگەواز.

بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر جێگاکەدا، ئامادەبووان هەستیان بە مەترسی کرد ، باش لە پەیامەکە گەیشتن، ئینجا چەمینەوە و دەنکەکانی تەسبیحەکەیان کۆکردەوە تاکو سەرلەنوێ بە پەتێکی بەهێزتر بیهۆننەوە ، هەڵسان و دەستیان کردە ملی یەکتر و بەوپەڕی دۆستایەتی و خۆشەویستیەوە تەوقەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، چاوەکان فرمێسکیان دەڕشت، دڵەکان تریەیان دەهات ، سینەکان بێگەرد و پاك.

سێ یەم : بانگکردنی خەڵك بۆ سەر رێگاکەی خوا :

پێویسته موسڵمان خەبات بكات بۆ بانگكردنی خەڵك بۆ سەر ڕێگاكەی خوا: ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ﴾ یوسف/١٠٨ .

بەڵێ پێویسته موسڵمان لەگەڵ چاكێتی خۆیدا هەلسێ بە گەیاندنی پەیامی خواپە خەڵكی و بانگكردنیان بۆ سەر ڕێگاكەی : ﴿قُلْ إِنِّى لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾﴾ الجن/٢٢-٢٣ .

واتە: بڵێ بەڕاستی من هەرگیز هیچ كەسێك لە خوا پەنام نادات ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێكم بكات، و هەرگیز پەناگایەكم دەست ناكەوێت جگە لای خوا نەبێت، بەڵكو من تەنها گەیاندنی پەیامەكان و بەرنامەی خوام لەسەرە ، جا ئەوەی لە خوا و پێغەمبەرەكەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیا بێت كە دۆزەخی بۆ ئامادە كراوە بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی.

ئەنجامدانی ئەم ئەركە تەكلیفێكی خواییە بۆ شایەتیدان لەسەر خەڵكی : ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ... ...﴾ البقرة/١٤٣ .

واتە: بەو شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێكی میانڕەو گێڕاوە تا ببنە شایەت بەسەر خەڵكیەوە وبۆ ئەوەی پێغەمبەریش شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بە ئەركی سەرشانی خۆیان هەستاون .

وە بۆ ئەوەی شایەتیەکی راستو دروست بدەین لە رۆژی قیامەتدا پێویستە یەکەم بە جوانترین شێوە پەیامەکەی خوایان پێڕاگەیەنین ، دووەمیش بزانین هەڵوێستیان چی یە لەم پەیامە . تا کاتێ پەروەردگار لە قیامەتدا پرسیاری لێکردین لەم شایەتیدانە بتوانین وەڵام بدەینەوە کە پەیامەکەمان گەیاند بە فلان و فلان هۆز هەندێکیان وەڵامیانداوە و هەندێکی تریشیان بێوەڵام بوون.

بەڵێ خوای گەورە هەڵگرتنی پەیامێکی بە باوەڕداران سپاردووە ، وە ئەرکێکی مەزنی خستۆتە گەردنیان کە بریتی یە لە : ڕێنماییکردنی خەڵکی بۆ رەوا، وە رابەرێکردنی خەڵکی بۆ خێرەوە روناککردنەوەی هەموو جیهان بە خۆری ئیسلام، لە پاشا خوای پەروز و بڵند پێشانی ئەدا کە باوەڕدار لە پێناو ئەم مەبەستەدا سەروماڵی فرۆشتوە بەخوا و تەرخانیکردوە لە پێناو سەرخستنی بانگەوازی ئیسلام دا و گەیاندنی بە دڵی خەڵکیو رزگارکردنیان لە تالّی ژیان : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ﴾ التوبە/١١١ .

واتە: بەڕاستی خوا ، گیان وماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانە . بەم شێوەیە موسڵمان سەرو ماڵی تەرخان دەکات بۆ بانگەوازەکەی ، وە لە قیامەتدا پاداشتەکەی وەردەگرێتەوە .

**هەنگاوی سێیەم : ڕێنماییکردن و فەرماندان بە راستی و رەوا :**

﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ﴾ .

بەڵێ ڕێنمایی کردن و فەرماندان بە ڕاستی و ڕەواپێویستە، بە دڵنیاییەوە هەستان و بەرگریکردن لە داد و ڕەواو سەلماندنیان ئەرکێکی سەخت و پڕمەترسییە ، وە کۆسپەکانی ڕێگای ئەنجامدانی ئەم ئەرکە ئەمانەن ( ئارەزووی دەروون، بیروباوەڕەکانی دەوروبەر، بیرسای بەرژەوەندی، یاخیگەریتی یاخیان، ستەمی ستەمکاران، توندوتیژی سەرسەخت و نامەردان، دەست درێژی دەست درێژکاران ...) بۆیە ئەوێشوی تایبەتی دەوێ ، ڕێنماییکردن، یادخستنەوە، ئامۆژگاری یەکتری، هاندان و ئاگادار کردنەوە! هێمان بۆ گەشەکردنی برایەتی، هەستکردن بە ئەرك و سپاردە! نیشانەن بۆ نزیکبونەوە لە مەبەست و ئامانج. ئامۆژگاری کردنی یەکتر کردەوەکانی تاکە تاکە کۆنەکانەوە و کاریگەری لە نێوانیاندا پێکدەهێنێ و گەشەیان پێدەکاو دەیانکاتە پاسەوانی ڕاستەقینەی داد و ڕەوا ، هەر کە پاسەوانێکی ڕەوا هەستی بەوە کرد کە تەنها نیە و کەسی تری لەگەڵدایە و ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەکات و پشتی دەگرێ و لە مەیداندا لەگەڵیدا دەوەستێ و هەڵوێستی لەگەڵدا دەگرێ، خۆشی دەویٔ و پشتی تێناکا و بەجێی ناهێڵێ، بەمە گێنجی ورەی بەرز دەبێتەوە و توانا و گەشە دەکات و زۆر دەبێت، ئیتر وایلێدێت بەرگە بگرێ وکۆڵنەدەر بێت . دەبێ ئەوەشمان لا ڕونبێ کە ئەم ئاینی ئیسلامە بەرز و ڕاوێساو نابێ بەبێ پاسکردنی لەلایەن کۆمەڵێ موسڵمانی یەکگرتووی هاوکارو ڕێنمایی کارو دەستەبەرکار و زامنکاری یەکتری کە برایەتی ئیمانی لە ناویاندا بدرەوشێتەوە ، وە بۆ پێکهێنانی ئەم کۆمەڵە خوای گەورە پەروەردەی ئیمانی و ڕاهێنان لەسەر چاکەکاری، لەسەر نەخشە جوانەکەی ڕێگای ڕزگاری سورەتی (العصر) خستە ڕیزی پێشەوە .

## هەنگاوی چوارەم : ئامۆژگاری وڕێنماییکردن بە ئارامگرتن :

﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾

پەروەردە بوون لەسەر باوەڕ و ڕاهاتن لەسەر کارکردنی چاك و هەستان بە ئەنجامدانی داخوازییەکانی پاسەوانی و پاراستنی داد و ڕەوا - گرانترین ئەرکی تاك و کۆمەڵی باوەڕدارە - ئەمەش ئارامی و ئارامگرتنی دەوێ ، ئارامگرتن لەسەر خەباتی بێ وچانی دەروون ، بەرەنگاری نەیاران، ئارامگرتن لەسەر ئازار و شەکەتی و ناڕەحەتی، ئارامگرتن لەسەر خۆهەڵکێشان و لەخۆ بایی بوون و ستەمی ستەمکاران، ئارامگرتن لەسەر بازدان و فەوتکردنی شەڕخوازان ، ئارامگرتن لەسەر دوور و درێژی قۆناغەکانی خەبات و ڕێگای گەیشتن بە سەرکەوتن و ... ئەمانە هەموو بۆ بەرەنگار بوونەوە و بڕینی ڕێگا و بەدەست هێنانی سەرکەوتن پێویستن بە شێنەیی و لەسەر خۆیی.

بەڵێ ئامۆژگاری و ڕێنماییکردن بە ئارامگرتن، توێشوی ڕێگایە و تواناکان شەحن و بەهێز دەکات، بە وروژاندنی هەستکردن بەتاقانەیی ئامانج و تەنهایی ڕوتێکراو، یەکێتی و پشتگیری هەمووان ، پێدانی خۆشەویستی و ورە و کۆڵنەدان ..تا کۆتا واتای کاری کۆمەڵی، کە ڕاستێتی ئیسلام لەو دۆخەدا نەبێ نازێ و دەرناکەوێ ئەنجامیش زیان و خەسارەتمەندییە. ئامۆژگاریکردنی یەکتر بۆ پاراستنی ڕەوا و دانبەخۆدا گرتن، ڕێنەی نەتەوەی موسڵمانی لێدێتە بەرچاو ، کە بوونێکی تایبەتی و پەیوەندیەکی سەربەخۆ و ڕێچکەیەکی یەکگرتووی هەیە ... ئەو نەتەوەیەی وەك چۆن هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەکان ئاوەهاش هەست بە بوونی خۆی دەکا، ڕاستی ئەو باوەڕ و ڕەفتارە چاکەی کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووە دەزانێ و هەر بەمەشەوە پێشڕەوایەتی

خۆی بۆ مرۆڤایەتی دێتە بەرچاو ..بۆیە هەمیشە ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکو سپاردە پیرۆزەی کە کەوتۆتە ئەستۆیان، یەکتر ئاراستە دەکەن و ئامۆژگاری یەکتر دەکەن بە نمونەی رەفتاری و گوفتاری بۆ ئارامگرتنو نەبەزینو کۆڵنەدان .

بەڵێ ئەمەیە تاکە رێگای رزگاری کە خوای گەورە دیاریکردووە و نەخشەی بۆ کێشاوە لە سورەتی(العصر) دا.

بۆیە هەر کە دوو موسڵمان لە هاوڕێیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەیەك دەگەیشتن لێکدانەدەبڕان هەتا هەردووك سورەتی(العصر)یان بۆ یەکتر نەخوێندبایە ..بەم خوێندنەوە بەڵێنیان تازە دەکردەوە بۆ یەکتر کە باوەڕەکەیان بتەوتر بکەن و چاکە بکەن، بەردەوام پشتگیری و ئامۆژگاری یەکتر بکەن بۆ پاراستنو سەرخستنی داد و رەوا، پاراستنی ئەم دەستورە خواییە، دانبەخۆداگرتن و ئارامگرتن ..

بەڵێنیان دەدا کە هەردووکیان لەم دەستەو بەرەیە بن کە باوەڕیان بەم دەستورە خواییە هاوردووە ..

ئینجا دۆعا خوازیان لە یەکتر دەکرد و دەڕۆیشتن بەدەم ئیش و کاریانەوە .

دەبا ئێمەش چاو لەوان بکەین تا رزگار ببین لە زیانو بە سەربەرزی بژینو بە سەربەرزیەوە بگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگارمان .

٢٨ ی رەمەزانی ١٤٢٤

تەواو بوو

# سەرچاوەکان


١- تەفسیری ئاسان — بورهان محمد أمین

٢- تەفسیری فتح القدیر — محمد بن علي بن محمد الشوكاني.

٣- في ظلال القرآن — سید قطب.

٤- أحیاء علوم الدین — تصنیف الامام أبي حامدمحمد بن محمد الغزالي.

٥- العودة الى القرآن — د. مجدي الهلال

٦- التوازن التربوي — د. مجدي الهلال

٧- نظرات في التربیة الایمانیة — د. مجدي الهلال

٨- فقه الدعوة الى الله — عبدالرحمن حسن جبكة المیداني

٩- الفتح الرباني و الفیض الرحماني — سید عبدالقادر الجیلاني

١٠- آداب الصحبة والمعاشرة مع اصناف الخلق — ،لامام الغزالي

# ناوەڕۆك




## لەم نامیلکەیەدا

- هەنگاوەکانی ڕزگاری مرۆڤ.
- ڕێگاکانی پەروەردەی ئیمانی.
- هۆکارەکانی کالبونەوەی ئیمان.
- هۆی جیاوازی نیوان گوفتار و کرداری موسولمان

دەخوێنیتەوە و وەڵامی کۆمەڵێ پرسیارت دەستدەکەوێت

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٠٩٠ ) ی ساڵی ٢٠١٣ پێدراوە